# گوڵبژێرێک لە وتەی سەلەف

ئامادەکردنی:

چەند فێرخوازێک

١. ئـای كـه كـه‌متـه‌ر خـه‌مـین...!

« وتـرا بـه‌ئیمامـی مالك بـاشتـرین كـار چییه بـه‌نده بیكات ؟ فه‌رمووی : طلب العلم »

ترتيب المدارك « ٦١ ».

---

٢. ڕێگای_ڕزگاری_كامه‌یه؟

ئیمامی مالیک ئه‌فه‌رمووێت :

سوونـنه‌ت كه‌شتی نـوح ـه‌، هه‌ركه‌سێکـ سواری سه‌ر پشتی بێ ڕزگاری بووه‌، وه‌ هه‌ركه‌سێکـ لێی دواكه‌وێت خنكاوه‌.

ذم الكلام للهروي (٨١)

---

٣. الإمام مالك رحمه‌الله ده‌ڵێ: به‌شێک(له‌ زانایان) ده‌فه‌رموون: زانست فێرنه‌بووم، ته‌نها بۆ خۆم نه‌بێ(كه‌ سوودی لێببینم). وه‌ فێری نه‌بووم ته‌نها ئه‌وه‌ نه‌بێ، خۆم موحتاجیم.

مالك ده‌ڵێ: وه‌ به‌هه‌مان شێوه‌ به‌شێک له‌ خه‌ڵكی ده‌فه‌رموون: زۆر له‌ یه‌كدیان نه‌ده‌كرد له‌ هه‌ندێ شـت، وه‌ پرسیاریان لـه‌سـه‌ركردبـا.

مالـك ده‌ڵێ : زانسـت حیكمه‌ته‌ وه‌ نورێكه‌ الله عزوجل هیدایه‌تی كێی بووێ پێیده‌دا، وه‌ زانسـت به‌ زۆری مه‌سئه‌له‌ نیه‌.

[ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٤٩]

---

٤. پرسیار له‌ ئیمام مالك كرا : ئایه‌ له‌ رشانه‌وه‌ ده‌ستنوێژ ده‌شورێ؟

- ووتی : نا به‌ڵام غه‌رغه‌ره‌ ده‌كا و ده‌می ده‌شوا، وه‌ ده‌ستنوێژی شی له‌سه‌ر نیـه‌.

الموطأ مالك بن أنس(لا :٣٥)

---

٥.	الأمام مالك رحمه الله دەفەرمووێ:

(لا تمكن زائغ القلب من أذنيك لا تدري ما يعلقك من ذلك، ولقد سمع رجل من الأنصار من أهل المدينة شيئا من بعض أهل القدر فعلق قلبه به، فكان يأتي إخوانه الذين استصحبهم فإذا نهوه قال: كيف بما علق قلبي ؟ لو علمت أن الله راض أن ألقي نفسي من فوق هذه المنارة لفعلت).

مەهێڵە کەسی دڵ نەخۆش و گومڕا قسەت بۆ بکات و گوێ بیستی بیت، نازانی کام ووتەی بە دڵتەوە دەنوسێ، کەسێک لە ئەنصار کە خەڵکی مەدینە بوو گوێ بیستی شتێک بوو لە کەسێک ئەهلی قەدەر، قسەکە بە دڵیەوە نوسا، دەچوو بۆلای براکانی کە هاوڕێیەتی کردوون، ئەوانیش نەهیان لێی کرد، ئەویش ووتی: ئەی چی لەوە بکەم کە بە دڵمەوە نوساوە ؟ گەر بزانم الله ڕازییە بەوەی خۆم هەڵدەمە خوارەوە لەسەر ئەم منارەیە ئەوا دەمکرد.

(الجامع لابن أبي زيد القيرواني : ١٢٠)

---

٦.	امام مالك بن أنس -رحمه الله تعالى فەرموی -:

ئەگەر بەندەیەك بگەڕێتەوە لای الله عز وجل ئەگەر بەقەد تەواوی زەوی تاوانی هەبوبێت و دواتر گەرانەوەکەی لەسەر سونەت و شوێنکەوتن بێت ئەوا لەگەل پێغەمبەران و پیاو چاکان و شەهیدان دایە و هاورێی ئەوان دەبێ

الجامع في العقائد لعادل آل حمدان (١/١٧٥)

---

٧.	مەعنی کوڕی عیسی ئەفەرمووێ: پیاوێک هەبوو لە شاری مەدینە (عەقیدەی مورجیئەکانی هەبوو) پێیان ئەوت أبو الجَورية ، ئیمامی مالک کە ناسی بەخەڵکی وت "کچی خۆتانی پێ مەدەن".

» ئافرەتانی موسڵمان تا مردن زەواج نەکەن بۆیان خێرترە لەوەی بکەونە ژێر دەستی کافرو مشرکێک یان بیدعەچییەک ..((شرح أصول الاعتقاد))

ئیمام مالیک -رحمەاللە- دەفەرموویت : هەرکەسێک بیدعەیەک ئیسلامدا دابهێنێت و بە بیدعەی حەسەنەی ببینێت و دابنێت ئەوا واگومانی بردووە پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوسلم) خیانەتی لەگەیاندنی پەیامەکەی کردووە.

الاعتصام للشاطبي(١/٦٤)

ئیمامی شەوکانی -رحمەاللە- دەفەرموویت : هیچ یەکێک لەئالوبەیت و شوێنکەوتوانیشیان نەیانوتووە مەولود دروستە.

الفتح الرباني(٢/١٠٩١)

ئیمامی شافعیش -رحمەاللە- لەمفهومی قولەکەیدا دەفەرموویت : کە هەرکەسێک شتێک لەدیندا دابهێنێت و بەشەرعیشی دابنێت ئەوە وەکو ئایەتە پیرۆزەکەی قورئان دەفەرموویت ئەوە شەرعی بۆ خەڵکی داناوە کە خوای گەورە داوای نەکردووە و پێشی ڕازی نیە...

---

٨. ئایا قورئان خوێندن دروستە بێ ئەوەی لێوت بجوولێنی؟

ابن رشد دەفەرموویت :

(( ئیمام مالیک پرسیاری لێکراوە کەسێک لەناو نوێژ قورئان دەخوێنێ بەڵام کەس گوێی لێ نییە و ئەویش گوێی لە خۆی نییە وە زمانی خۆی ناجوولێنیت ووتی : ئەمە خوێندنەوە نییە بەلکو خوێندنەوە ئەوەیە کە زمان بجولێت ))

البيان و التحصيل ج١ لاپەڕە ٤٩٠

---

٩. یەحیای کوڕی یەحیا لە ئەندەلوسەوە " ئیسپانیای ئێستا " هات بۆ لای ئیمامی مالیک تا دەرسی لا بخوێنێ و لەزانستە سەرسوڕهێنەرەکەی سوود وەرگرێ، ڕۆژێک لەگەڵ چەند قوتابیەکی تر دانیشتبوون لەخزمەت ئیمام و دەرسیان دەخوێند، دەنگێک هات گوتی:

"فیل خەڵکینە فیل".

قوتابیەکان هەموویان ڕایانکرد تا فیل ببینن، تەنها یەحیا نەبێت!

ئیمامی مالیک بەیەحیای گووت: چۆن بوو تۆش نەڕۆیشتی خۆ لە ئەندەلوس فیلی لێ نیە؟

یەحیا فەرمووی: یا ئیمام من ئەو ڕێگایەم بڕیوە تا بێم فێری زانست بم نەوەک سەیری فیل بکەم!

لە کتێبی "طبقات الفقهاء للشيرازي (١٥٢)"

---

١٠. « خۆ پارێزی ئیمام مالیک رحمه الله لە فەتوا دان »

قال مالك بن أنس: ما أفتيتُ حتى شهِد لي سبعون أني أهل لذلك.

(حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني )

واتە : هیچ فەتوایەکم نەدا ، تاوەکو حەفتا کەس لە ئەهلی علم ، شایەدیان بۆ دام کە ئەهلم بۆ فەتوا دان .

قال خلف بن عمرو: سمعت مالك بن أنس يقول: ما أجبت في الفتيا حتى سألت من هو أعلم مني، هل يراني موضعًا لذلك؟ سألتُ ربيعة، وسألت يحيى بن سعيد، فأمراني بذلك،فقلت له: يا أبا عبدالله، فلو نهَوْك؟ قال: كنت أنتهي، لا ينبغي لرجل أن يرى نفسه أهلًا لشيء حتى يسأل من هو أعلم منه.

(حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني ) .

خەلەفی کوڕی عەمر دەڵێت : گوێم لە ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس بوو دەیفەرموو : جوابی هیچ پرسیارێکم نەداوەتەوە تاوەکو پرسیارم لە کەسانێک کردووە کە زۆر شارەزاتر بوونە لەمن، پێم وتوون : ئایە لە توانای زانستی من دەبینن بۆ ئەوەی فەتوا بدەم ؟ پرسیارم لە ڕەبیعە و یحیی کوری سعید کرد ، هەردووکیان فەرمانیان پێ کردم کە فەتوا بدەم .

خەلەفی کوڕی عەمر : ئەی باوکی عبداللە « ئیمام مالیک » ئەگەر وتبایان ئەهل نیت بۆ فەتوادان و ڕێگریان لێ کردبای ؟ ئیمام مالیک فەرمووی منیش وازم دەهێنا !! پاشان فەرمووی : نابێت مرۆڤ وا سەیری خۆی بکات کە شایستەیە بۆ ئەنجامدانی شتێک ، تا پرسیار لە کەسانی لە خۆی شارەزاتر نەکات ئایە ئەو ئەهلە بۆ فەتوا دان .

---

١١. زەلیلکردنی زانست. وە باسی طالب العلم.

ـ ابن وهب دەڵێ: بیستم لە الإمام مالك فەرمووی: زەلیلی و ئیهانە کرد بە زانست، ئەوەیە کاتێ پیاو قسەی کرد بە علم، لەگەڵ یەکێکی بکا کە(دەزانێ) گوێرایەڵی ناکا.

[ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٥١ ]

ابن وهب دەڵێ: بیستم لە مالك فەرمووی: بێگومان ئەوکەسەی داوای علم دەکا دەبێ نەرموونیان و ئارامگر و بە خەشیە بێ، وە دەبێ شوێنکەوتەی آثاری پێش خۆی بێ(لە سەلەف).

[ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٥٢]

---

١٢. پرسیار کرا لە ئیمامی مالک(رحمه الله) باشترین کار چییە بەندە بیکات.؟ فەرمووی : طلب العلم.

[ترتيب المدارك :٦١]

---

١٣. اسحاق بن راهويه دەفەرموێت :- گوێم لە يحيى بن آدم بـوو گـووتی :- احمد بن حنبل پێشەوامـانه .

طبقات الحنابلة

فضائل_إمام_احمد٢

١٤. قال ابن وهب: قيل لأخت مالك بن دينار رحمه الله: ما كان شغل مالك في بيته؟ قالت: المصحف،التلاوة.

ئيبن وەهب فەرموويەتی: بەخوشکی مالیک ـی کوڕی دینار رەحمەتی الله ـی لێ بێت وترا :ئیشی مالیک لەماڵەوە چی بوو؟ فەرمووی: قورئان و،خوێندنەوەی.

[السير (تهذيبه) ٢/٧٣٦]

١٥. امام مالك بن أنس -رحمه الله تعالى فەرموی -:

ئەگەر بەندەیەك بگەڕێتەوە لای الله عز وجل ئەگەر بەقەد تەواوی زەوی تاوانی هەبوبێت و دواتر گەرانەوەکەی لەسەر سونەت و شوێنکەوتن بێت ئەوا لەگەل پێغەمبەران و پیاو چاکان و شەهیدان دایە و هاورێی ئەوان دەبێ

الجامع في العقائد لعادل آل حمدان (١/١٧٥)

١٦. ئیمامـی مالك رَحِمـهُ الله:

ئـەمـ عیلمـــە گۆشت و خـوێنتـە ، لـەسـەری پرسیـارت لـێ ئـەکرێ لەڕۆژی قیـامـەت ، بـزانـە لە کێـی وەرەگـری

ومـا أجمَل قـول الإمـامـ مالك رَحِمـهُ الله:

إن هـذا العـلـمـ هـو لحـمُكَ ، وَدَمُّكَ ، وعـنـه تُـسأل يـوم القيـامَـة ، فـانظر عمَّن تأخـذه

|الخـطيـب فـے الكفايـة(٢١)|

١٧. ماليكى كوڕى دينار ( ڕەحمەتى خواى لێ بێت ) دەڵێ : ئەگەر بەردان بكێشيەوە لەگەڵ چاكەكاران باشترە لە خواردنى حەلوا و شيرينى لەگەڵ خراپەكاران .

روضة العقلاء ، ص /١٠٠

١٨. ئيمامى شافعي (رحمه الله) دەڵێت

حەق و ڕاستى هەر ڕاستيە ئەگەرچى ئەهلەكەشى كەم بێت

باتڵ ـيش هەر باتڵە ئەگەرچى ئەهلەكەشى زۆربێت .

[آداب الشافعي ومناقبه / ٣٠]

١٩. عن حَرْمَلَةُ قالَ سَمِعْتُ الشَّافِعِيَّ يَقُولُ:

" پێم خۆشە هەر چيەكى ئەيزانم خەڵک لە منەوە فێرى بن پاداشتى - لەلاى الله - وەرگرم و كەسيش باسم نەكات ".

التبيان في آداب حملة القرآن ـ ٣٦

٢٠. ئيمامى شافعى دەفەرموێت:-

'فێربونى زانستى شەرعى خێرى زياتر و باشترە لە نوێژى سوننەت'.

جامع بيان العلم وفضله (١١٨)

٢١. هەر كاتێ فەرموودەيەكى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم صحيح و ڕاست بوو ، ئەوە مەزهەب و پێشڕەوى ڕاستەقينەى منە.!

ئيمامى شافيعى رحمه الله

٢٢. الإمام الشافعي رحمه الله دەڵێت :

" دڵگران مەبە لەدونیا بۆ ئەوشتانەی لەدەستت چون لەکاتێکدا ئیسلامەتی و سەلامەتیت هەیە " .

مناقب الشافعي للبيهقي

---

٢٣. ئیمامی شافعی ڕەحمەتی الله ی لێبێت فەرمووی: «پێ نازانم هیچ زانستێک پاش فێربوونی حەڵاڵ و حەرام بەڕێزترو باشتر بێت لە زانستی پزیشکی».

سير أعلام النبلاء

---

٢٤. إمام شافعی رَحِمَهُ اللَّه ئەفەرموێ: گوێم لە یەکێک لە هاوڕێ متمانە پێ کراوەکانم بوو کە ووتی: «هاوسەرگیریم کرد تا پارێزگاری لە دینەکەم بکەم ، کەچی دینی خۆم و دینی دایکم و دینی دراوسێکەشمان ڕۆشت و لە دەستمان دا».

مَنَاقِب الإمَام الشَّافِعِيّ

---

٢٥. طلبنا ضياء القبور فوجدناها في قراءة القرآن

داوای ڕوناکبونەوەی قەبرمان کرد: لە خوێندنەوەی قورئاندا دۆزیمانەوە

"الشافعي" رحمه الله

---

٢٦. الإمام الشافعي (رحمه الله) دەفەرمووێت:

ئەگەر هاوڕێیەکەت هەیە و یارمەتیت دەدات لەسەر طاعەتی الله تعالى، توند بە دەستەکانت بیگرە چونکە دۆزینەوەی ئەم جۆرە هاوڕێیە قوڕسە، وە دابڕانیش لێی ئاسانە.

حلية الأولياء (٤ / ١٠١)

---

٢٧. ئیمامی شافعي | رحمه الله | ئەفەرمووێت

هەرکەسێک دەیەوێت الله تعالی دڵ و دەروونی بکاتەوە و ڕووناکی بخاتە دڵیەوە با باس لە شتێک نەکات کە پەیوەندی پێوە نیە

مناقب الشافعي للبيهقي | ٢/١٧١

---

٢٨. ئیمام الشافعي - رحمه الله دەفەرموێت -:

بزانە! هیچ ڕێگایەک نیە بۆ سەلامەت بون لەخەڵکی، تەماشاکە چی سودی تۆی تێدایە پابەند بە پێیەوە.

سير أعلام النبلاء (٤٢/١٠)

---

٢٩. [من سب النبي ﷺ من مسلم أو كافر فإنه يجب قتله]

◉ قال ابن المنذر (٣١٨هـ) "من علماء الشافعية":

«أجمع عوام أهل العلم على أن حدّ من سب النبي ﷺ القتل، وممن قال بذلك: مالك والليث وأحمد وإسحاق وهو مذهب الشافعي»

قال ابن تيمية: «هذا مذهب عامة أهل العلم»

◉ پێشەوا ابن المنذر (٣١٨هـ) "لە زانا شافعیەکانە" دەفەرمووێت: «عەوامی ئەهلی عیلم یەکدەنگن لەسەر حەددی - سزای - ئەو کەسەی جوێن بداتە پێغەمبەر ﷺ دەکوژرێ، ئەمەش قسەی: مالك و الليث و أحمد و إسحاق وە ئەمە مەزهەبی شافعیە»

پێشەوا ابن تیمیة دەفەرمووێت: «ئەمە مەزهەبی هەموو ئەهلی عیلمە»

÷ الصارم المسلول على شاتم الرسول (٣)

---

٣٠. [ جِمَاعُ المَعرُوفِ كَفُّ المَكرُوهِ ]

◉ قال الإمام الشافعي: "وجِمَاعُ المعروف كفُّ المكروه."

◉ ئیمامی شافعی دەفەرمووێت: "کۆکراوەی هەموو چاکەیەک دوورکەوتنەوەیە لە خراپە."

كتاب الأم للشافعي (٥/٨٩)

---

٣١. سأل رجل الإمام الشافعي فقال: يا أبا عبد الله! أيما أفضل للرجل أن يُمكَّن أو يُبتلى؟

◉ فقال الإمام الشافعي: «لا يمكَّن حتى يُبتلى، فإن الله ابتلى نوحًا وإبراهيم وموسى وعيسى ومحمدًا صلوات الله وسلامُه عليهم أجمعين، فلما صبروا مكَّنهم»

❖ پیاوێک پرسیاری لە ئیمامی شافعی کرد وتی: ئەی باوکی عبدالله کامەی باشترە بۆ پیاو جێگیر بێت یاخود تووشی تاقیکردنەوە بێت؟

◉ ئیمامی شافعی فەرمووی: «جێگیربون نایەت ئیللا لەپاش تاقیکردنەوە نەبێت چونکە الله نوح و إبراهيم وموسیٰ وعیسیٰ ومحمد سەڵەوات و سەلامی اللهیان لێبێت هەموویان تاقیکردەوە کە ئارامیان گرت ئینجا الله جێگیربوونی پێ بەخشین»

جامع المسائل لابن تيمية (٣/٢٥٤)

---

٣٢. قال الإمام أحمد بن حنبل: «ما لك لا تنظر في كتب الشافعي؟ فما من أحد وضع الكتب منذ ظهرتُ أتبع للسنَّة من الشافعي»

◉ ئیمامی أحمد ـی کوڕی حنبل دەفەرمووێت: «چیتە سەیری کتێبەکانی شافعی ناکەیت؟

هیچ كەسێک نیە كتێبی نووسی بێتەوە لەوەتەی لە دایک بوومە شوێنكەوتوو تر بێت لەبۆ سوننەت لە شافعی»

آداب الشافعي ومناقبه (٤٦)

---

٣٣. قال الإمام الشافعي: «أرفع الناس قدراً من لا يرى قدره، وأكثرهم فضلاً من لا يرى فضله»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرموویت: «بەرزترین كەس لەناو خەڵک ئەو كەسەیە كە لەخۆ بایی نیە، وە چاكترین كەس ئەو كەسەیە كە چاكی خۆی نابینیَ»

سير أعلام النبلاء (١٠/٩٩)

---

٣٤. ﴿يِا أَيُّها الَّذين آمنوا إن تتَّقوا الله يجعل لَّكم فرقاناً﴾

◉ قال الإمام مالك للشافعي أول ما لقيه: «إني أرى الله قد ألقى على قلبك نورًا، فلا تطفئه بظلمة المعصية»

◉ ئیمامی مالك بە شافعی فەرموو یەكەم جار كە بینی: «من دەبینم پەوەردگار ڕووناكی خستۆتە ناو دڵت، ئاگاداربە نەیكوژێنیەوە بە تاریكی تاوان»

إعلام الموقعين (٢/٢٥٨)

---

٣٥. المزني والربيع دەڵێن: پیاوێكی بەتەمەن هات بۆ لای ئیمامی شافعی وتی: پرسیار بكەم؟

شافعی فەرمووی: بپرسە

پیاوەكە وتی: چ شتێک لە دینی الله بەڵگەیە؟

شافعی فەرمووی: كتێبی الله،

پیاوەکە وتی: چی تریش؟

شافعی فەرمووی: سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

پیاوەکە وتی: چی تریش؟

شافعی فەرمووی: یەکدەنگی ئوممەت،

پیاوەکە وتی: لە کوێی قورئان هێناوتە یەکدەنگی ئوممەت؟ شافعی بیریکردەوە ماوەیەک.

پیاوەکە وتی: سێ ڕۆژان کاتت پێئەدەم بزانم چی دەڵێی، شافعی ڕەنگی تێکچوو دواتر ڕۆیشت، سێ ڕۆژ و شەو لە ماڵ نەهاتە دەرەوە،

دواتر هاتە دەرەوە پیاوەکەش بەپەلە هات وتی: پرسیارەکەم؟

شافعی فەرمووی: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم بسم الله الرحمن الرحيم الله تعالى دەفەرمووێت: (وەهەرکەسێک دژایەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە وشوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێت بێجگە لەڕێگای بڕواداران ڕووی وەردەگێڕین بۆئەو ڕێبازەی کەهەڵی بژاردووە و دەیخەینە دۆزەخ ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە) دەی کەسێک لەسەر جیاوازی ڕێبازی موسڵمانان ناخرێتە دۆزەخ، گەر فەرز نەبایە. پیاوەکە وتی: ڕاستەکەی، دواتر هەڵسا و ڕۆیشت.

شافعی فەرمووی: «قورئانم سێ شەو و ڕۆژ خوێندەوە تاکو دۆزیمەوە»

طبقات الشافعية (٢/٢٤٣)

---

٣٦. قال الإمام الشافعي (٢٠٤هـ): «اتفاق المسلمين على منع النساء من الخروج سافرات»

◉ ئیمامی شافعی (٢٠٤هـ) دەفەرمووێت: «موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ڕێگری کردن لە ژنان لە سفووری»

روضة الطالبين (٥/٣٦٦)

---

٣٧. قال الإمام سحنون التنوخي (٢٤٠هـ) : «لم يكن في الشافعي بدعة»

قال الذهبي: «فصدق والله، فرحم الله الشافعي، وأين مثل الشافعي والله في صدقه، وشرفه، ونبله، وسعة علمه، وفرط ذكائه، ونصره للحق، وكثرة مناقبه؟! رحمه الله تعالى»

پێشەوا سحنون التنوخي (٢٤٠هـ)دەڵێت:«ئیمامی شافعی هیچ بیدعەیەکی نەبووە»

الذهبي دەڵێت: «ڕاست دەکات سوێند بەخوا، ڕەحمەتی خوا لە شافعی بێت، جا لە کوێ هەیە وەکو شافعی لە ڕاستگۆی و شەرف و حەق پێکاندن و زۆری عیلم و زیرەکی و ژیری و پشتیوانی کردنی لە حەق و سیفەتە باشەکانی، ڕەحمەتی خوای لێبێت»

سير أعلام النبلاء (١٠/٩٥)

---

٣٨. روي أن الشافعي أقام في علم العربية عشرين سنة، فقيل له في هذا، فقال: «ما أردت بهذا إلا استعانةً للفقه»

عن إبراهيم الحربي - تلميذ الإمام أحمد بن حنبل - أنه قال: «من تكلم في الفقه بغير لغة؛ تكلم بلسان قصير»

◉ ریوایەت کراوە کە ئیمامی شافعی بیست ساڵ فێری زمانی عەرەبی بووە، پرسیاریان لێکرد بۆچی وات کرد، فەرمووی: «تەنها لەبۆ یارمەتی دانم لە تێگەیشتن فیقه»

پێشەوا إبراهيم الحربي - قوتابی ئیمامی أحمدی کوڕی حنبل - دەفەرمووێت: «هەر کەسێک قسە لە فیقه بکات و شارەزایی نەبێت لە زمانی عەرەبی؛ بە زمانێکی کورت قسە دەکات»

الفقيه والمتفقه (٢/٤٢)

---

٣٩. قال الإمام الشافعي عن أحكام أهل الذمة:

«ولا يُحدِثوا في مصر من أمصار المسلمين كنيسة، ولا مجتمعًا لصلواتهم، ولا صوت ناقوس»

◉ ئیمامی شافعی لە دەربارەی جوولەکە و گاورەکان دەفەرموویت:

«وە نابێ لە وڵاتێک لە وڵاتەکانی موسڵمانان کەنیسە دابنرێت، وە شوێنێک لەبۆ نوێژەکانیان، وە دەنگی ناقوسەکانیان»

کتاب الأم للشافعي (٤/٢١٨)

---

٤٠. قال رسول الله ﷺ: «أنا زعيمٌ ببيت في ربض الجنة لمن ترك المراء وإن كان محقا» رواه أبو داود بإسناد صحيح.

◉ قال الإمام الشافعي:«ما نظرت أحدًا فأحببت أن يخطىء»

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: «من زامنم بەماڵێک لە خوارەوەی بەهەشت بۆ ئەو کەسەی وازبێنێ لە مشتومڕی ئەگەر لەسەر حەقیش بوو»

◉ ئیمامی شافعی دەڵێت:«مشتومڕیم لەگەڵ هیچ کەسێک نەکردوە حەزم کردبێت هەڵە بکات»

صفة الصفوة (٢/٢٥١)

---

٤١. قال البُويطي: قلت للشافعي: إنك تتعنّى في تأليف الكتب وتصنيفها، والناس لا يلتفتون إلى كتبك، ولا إلى تصنيفك.

فقال: «يا بني، إن هذا هو الحق، والحقُّ لا يضيع»

◉ البُويطي دەڵێت: بەئیمامی شافعی ـ م وت: زۆر خۆت ماندوو دەکەی بەنووسینەوەی کتێب، وە خەڵک سەیری کتێبەکانت و نووسینەکانت ناکەن.

فەرمووی: «ڕۆڵەکەم، ئەمە حەقە وە حەقیش نافەوتێ»

المقفى الكبير (٥/٢٠٧)

---

٤٢. [ بَابُ حُسْنُ اعتِقَادِ الشَّافِعِيِّ]

◉ عن الربيع بن سليمان المُرَادِي قال:

سمعت الشافعي يقول: «إذا وجدتم في كتابي خلاف سنة رسول الله ﷺ فقولوا بسنة رسول الله ﷺ ودعوا ما قلت»

◉ پێشەوا الربيع ـی کوڕی سليمان المُرَادِي دەڵێت:

گوێم لە شافعی بوو دەیفەرموو: «ئەگەر لە کتێبم پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرتان ﷺ دۆزیەوە، بەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ کار بکەن وە وازبێنن لەقسەی من»

كتاب مناقب الشافعي (١/٤٧٢)

---

٤٣. عن هارون ابن سعيد بن الهيثم الأَيْلِ:

دخل بعض فقهاء مصر على الشافعي في السَّحَر وبين يديه المصحف، فقال: «شغلكم الفقه عن القرآن، إني لأصلي العَتَمَةَ، وأضع المصحف بين يدي فما أُطْبِقُه حتى أُصبح»

◉ هارون کوڕی سعيد کوڕی الهيثم الأَيْلِ دەڵێت:

هەندێک لە فەقیهەکانی میسر چوونە لای ئیمامی شافعی لەکاتی بەرەبەیانی، قورئان لەنێو دەست بوو، فەرمووی: «فیقهـ سەرقاڵی

کردوونه لەخوێندنەوە قورئان، من نوێژی عیشا دەکەم وە قورئانەکەم دادەنێم لەنێو دەستم دایناخەم تاکو بەیانی»

كتاب مناقب الشافعي (١/٢٨١)

---

٤٤. عن الربيع بن سليمان، قال: سمعت الشَّافعيِّ، يقول: «صحبةُ مَنْ لا يخشى العار عارٌ في القيامة»

الربيع ـی کوڕی سلیمان دەڵێت گوێم لە شافعی بوو دەیفەرموو: «هاوڕێیەتی کەسی بێ شەرم، شەرمەزاریە لە قیامەتدا»

⸎ الإبانة الكبرى لإبن بطة العُكْبَرِّيّ (١/١٧٣)

---

٤٥. قال الشّافِعِيُّ رحمه الله:

« ما أَحَدٌ إلَّا وله مُحِبٌّ ومُبغِضٌ، فإن كان لا بُدَّ مِن ذلك، فليكُن المرءُ مع أهلِ طاعة اللهِ عزَّ وجَلَّ ».

◉ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێت:

« هیچ کەس نیە ئیللا خۆشەویست و دوژمنی هەیە، ئەگەر هەر دەبێ وابێت، با مرۆڤ لەگەڵ ئەهلی تاعەت و عیبادەتی پەروەردگار بێت ».

حلية الأولياء (٨/١١٧)

---

٤٦. قال رسول الله ﷺ: «من خاف أن لا يقوم من آخر الليل فليوتر أوله، ثم ليرقد» رواه مسلم (٧٥٥).

◉ قال الإمام الشافعي: «الوتر.. من تركها كان أسوأ حالًا ممن ترك جميع النوافل في الليل والنهار»

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: «ئەوی ترسا لەکۆتای شەو هەڵنەستێ با نوێژی وتر لەسەرەتای شەو بخوێنێ، دواتر بخەوێت» رواه مسلم (٧٥٥).

◉ ئیمامی شافعی دەڵێت: «نوێژی وتر.. ئەوەی وازی لێ بێنێت حاڵی خراپترە لەو کەسەی واز لەهەموو سوننەتەکانی شەو و ڕۆژ دێنێت»

كتاب الأم للشافعي (١/٨٧)

---

٤٧. قال المزني، سمعت الشافعي رضي الله عنه، يقول: «السخاء والكرم يغطيان عيوب الدنيا والآخرة بعد أن لا يلحقهما بدعة»

◉ المزني دەڵێت: گوێم لە شافعی بوو دەیفەرموو:

«سەخی بوون و بەخشین عەیبی دونیا و دواڕۆژ دادەپۆشن بەمەرجێک بیدعە لەدوا نەبێت»

طبقات الشافعيين لابن كثير (١/٢٥)

---

٤٨. قال الإمام الشافعي: «إذا كثرت الحوائج فابدأ بأهمها»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرموویێت: «ئەگەر پێویستەکانت زۆر بوون بە گرینگترینیان دەست پێبکە»

طبقات الشافعيين لابن كثير (١/٣٠)

---

٤٩. قال الإمام الشافعي: «لو اجتهدت كلَّ الجهد على أن ترضي النَّاس كلَّهم فلا سبيل إليه، فإذا كانَ كذلك فأخلص عملكَ ونيَّتكَ لله»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرموویێت: «ئەگەر هەموو هەوڵ و کۆششی خۆت بدەی بۆ ڕازی کردنی خەڵک لە خۆت هیچ ڕێگایەک نیە بۆ ڕەزامەندیان، جا ئەگەر وا بوو کار و نیەتت بۆ پەروەردگار خاڵس بکەوە»

كتاب مناقب الشافعي (٢/١٧٣)

---

.٥٠ قال الإمام الشافعي رحمه الله:

« ما ناظرت أحداً قط إلا أحببت أن يوفق ويسدد ويعان، ويكون عليه رعاية من الله وحفظ، وما ناظرت أحدا إلا ولم أبال بين الله الحق على لساني أو لسانه ».

ئيمامی شافعی رحمه الله دەفەرمووێت:

« وتووێژم لەگەڵ هەر کەسێک کردبێت پێم خۆش بووە یارمەتی بدرێت و بیپێکێت، وە پاراستنی خوایشی لەسەر بێت، وە لەگەڵ هەرکەسێکدا وتووێژم کردبێت گوێم نەدەدا حەق ڕوون بێتەوە لەسەر زمانی من بێت یان زمانی ئەو ».

حلية الأولياء (٩/ ١١٨)

---

.٥١ قال الإمام الشافعي رحمه الله:

« أحمد إمام في ثمان خصالٍ: إمام في الحديث، إمام في الفقه، إمام في اللغة، إمام في القرآن، إمام في الفقر، إمام في الزهد، إمام في الورع، إمام في السُّنة ».

ئيمامی الشافعي رحمه الله دەفەرمووێت:

« أحمد پێشەوایە لە هەشت شتدا: پێشەوایە لە حەدیس، پێشەوایە لە فیقهە، پێشەوایە لە زمانی عەرەبی، پێشەوایە لە قورئان، پێشەوایە لە فەقیری، پێشەوایە لە زوهد، پێشەوایە لە وەرەع، پێشەوایە لە سوننەت ».

طبقات الحنابلة (١/٥)

---

٥٢. قال الإمام الشافعي لصاحبه الربيع:

« لا تتكلم فيما لا يعنيك ، فإنك إذا تكلمت بالكلمة ملكتك ولم تملكها ».

ئیمامی شافعی به هاوەڵەکەی ربیعی فەرموو:

« قسە مەکە لە شتێک پەیوەندی بەتۆوە نیە، چونکە ئەگەر وشەیەک بڵێی ملکەچی دەبیت وە ملکەچت نابێت ».

المستطرف في كل فن مستظرف (١١٩)

---

٥٣. [ قراءة القرآن في الليل ]

◉ قال الإمام الشافعي:« وإن كنت أحبُّ ألّا يدع أحد أن يقرأ ما تيسر عليه من ليلته يعني من القرآن ».

◉ ئیمامی شافعی دەڵێت: «پێم خۆشە هەموو کەسێک لە شەودا بەپێی توانا بخوێنێتەوە لە قورئان»

÷ كتاب الأم للشافعي (١/٧٣)

---

٥٤. [ أبواب الإعتقاد التي ضلت بها المبتدعة سبعة ]

قال الإمام قوام السُّنة الأصبهاني:

« قال بعض العلماء: الأصول التي ضَلَّت بها الفِرق سبعة أصول: الكلام في ذات الله، وصفاته، وأفعاله، والقول في الوعيد، وفي الإيمان، وفي القرآن، وفي الإمامة ».

پێشەوا قوام السُّنة الأصبهاني دەڵێت:

« بەشێک لە زاناکانمان دەڵێن: ئەو بنچینانەی کە کۆمەڵە گومڕاکان تیایا گومڕا بوون حەوت بنچینەیە: قسەکردن لە زاتی پەروەردگار، وە

سیفەتەکان، وە کردارەکانی، وە قسەکردن لە وەعید و سزا، وە لە ئیمان، وە لە قورئان، وە لە ئیمامەت ».

الحجة في بيان المحجة: (٢/٢٨٢)

---

**٥٥.** قال الإمام الشافعي - رحمه الله - :

« مَن كتب الحديث قويت حُجَّتُه ».

ئیمامی #شافعی رحمه الله دەفەرمووێت:

« هەر کەسێک حەدیس بنووسێتەوە بەڵگەی بەقوەت دەبێت ».

حلية الأولياء.

---

**٥٦.** حدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا الربيع بن سليمان المرادي، قال: جاء رجل يناظرِ الشَّافعيَّ في شيءٍ، فقال: « دَع هذا فإنَّهُ طريقُ الكلامِ ».

قال: وَسَمِعَ الشَّافعيَّ رجلينِ يتكلمانِ فِي الكلامِ، فقال: « إمَّا أن تُجاورانا بخيرٍ، وإمَّا أن تقوما عنّا ».

پێشەوا الربيع ـی کوڕی سليمان المرادي، دەڵێت: پیاوێک هات بۆلای شافعی بۆ ئەوەی مونازەرەی لەگەڵ بکات لەسەر شتێکدا، فەرمووی: « وازی لێبێنە ئەمە ڕێگای ئەهلی کەلامە - موبتەدیعەکان - ».

دەڵێت: وە ئیمامی شافعی گوێی لە دوو پیاو بوو قسەیان ئەکرد لەسەر عیلمی کەلام، فەرمووی: « یان ئەوەیە بەخێر لەلای ئێمە دانیشن، یان ئەوەیە لەلای ئێمە نەمێنن ».

الإبانة الكبرى لإبن بطة (١/٢١٧)

---

٥٧. قال رسول الله ﷺ:

« إذا سَقَطَ الذُّبابُ في إناءِ أحدِكم فليغمِسهُ فإنَّ في أحدِ جناحيهِ داءً وفي الآخرِ شفاءً ».

قال الإمام الشافعي رحمه الله:

" وَغَمسُ الذُّبَابِ فِي الإِنَاءِ لَيسَ بِقَتلِهِ ".

واته: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت:

" ئەگەر مێش کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێک لە ئێوە، مێشەکە هەمووی نوقوم بکات، پاشان دەری بهێنێت و فڕێی بدات، چونکە باڵێکی دەرمانی پێوەیە و باڵەکەی تری دەردە ".

ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێت: "وە نوقوم کردنی مێش لە خواردنەوەی نەک کوشتنی".

الجامع لشعب الايمان للبيهقي.

---

٥٨. « كان الشافعي شديداً على أهل الإلحاد، وأهل البدع، مجاهراً ببغضهم، وهجرهم ».

"ئیمامی الشافعي توند بووە لەسەر مولحیدەکان، وە ئەهلی بیدعە، وە بە ئاشکرایی ڕقی لێیان بوو، وە لێیان دوور دەکەوتوە".

مناقب الشافعي؛ ١/٤٦٩

---

٥٩. قال امام الشافعي رحمه الله:

مَنْ شَهِدَ الضَّعفَ مِنْ نَفسِهِ، نالَ الإستقامة.

ئیمامی شافعی رەحمەتی اللەی لێبێت فەرموویەتی:

هەرکەسێک درکی بە خاڵە لاوازەکانی خۆی کرد دامەزراوی بەدەست دێنێت.

تهذيب الأسماء و اللغات: ١/٥٥

---

٦٠. قال الإمام الشافعي: «أشدُّ الأعمال ثلاثة: الجود من قلَّة، والورع في الخلوة، وكلمة الحق عند من يُرجى ويُخاف»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرمووێت: «سەختترین کردەوە سێ شتە: بەخشین لە نەداری، وە لەخوا ترسان لە تەنیایی، وە وشەی حەق لەلای کەسێک داوای لێ دەکرێ وە خەڵک لێی دەترسێت»

صفة الصفوة (١/٥٣١)

---

٦١. أوصى الشّافعي تلميذه الرّبيع بن سليمان، فقال له: «وإذا أردت صلاح قلبك أو ابنك أو أخيك، أو من شئت صلاحه، فأودعه في رياض القرآن، وبين صحبة القرآن، سيصلحه الله شاء أم أبى»

◉ ئیمامی شافعی وەسیەتی قوتابییەکەی خۆی الربیع ـی کوڕی سلیمان کرد، پێی فەرموو: «ئەگەر ویستت دڵت چاک بێ یان کوڕەکەت یان براکەت یان هەر کەسێک ویستت چاک بێت، ئەوە بیسپێرە بە ژینگەیەکی قورئان، وە لەنێوان هاورێیانی قورئان، پەروەردگار چاکی دەکات، بیەوێت یان نەیەوێت»

حلية الأولياء لأبي نعيم (٩/١٢٣)

---

٦٢. قال الإمام الشافعي: «لا تسكنن بلدًا لا يكون فيه عالم يفتيك عن دينك، ولا طبيب ينبئك عن أمر بدنك»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرمووێت: «لە شارێک نیشتەجێ مەبە زانایەکی لێ نەبێت فەتوات بۆ بدات لە دینەکەت، وە دکتۆرێک لێ نەبێ حاڵی جەستەی خۆتت پێ بڵێ»

آداب الشافعي ومناقبه (٢٤٤)

٦٣. قال الإمام الشافعي: «يحتاج طالب العلم إلى ثلاث خصال: أولها: طول العمر، والثاني: سعة ذات اليد، والثالث: الذكاء»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرمووێت: «فێرخوازی عیلم پێویستی بە سێ شتە: یەکەمی: تەمەن درێژی، وە دووەم: دەوڵەمەندی، وە سێیەم: ژیری»

كتاب مناقب الشافعي (٢/١٤٢).

٦٤. [ اختَر لنَفسِك صُحبَةً صَالحَة ]

◉ قال الإمام الشّافعي:

«ينبغي للرَّجل أن يتوخى لِصُحْبَتِهِ أهل الوفاء والصّدق، كما يتوخى لوديعته أهل الثقة والأمانة»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرمووێت:

«پێویستە لەسەر مرۆڤ کەسی بەوەفا و ڕاستگۆ بۆ هاوڕێیەتی خۆی هەڵبژێرێت، وەک چۆن لەبۆ ماڵ و سامانی خۆی کەسێکی متمانە پێکراو هەڵدەبژێرێت»

كتاب الإنتقاء (٩٩)

٦٥. البويطي دەڵێت : گوێم لە شافعي بوو ، دەيفەرموو :

« عليكم بأصحاب الحديث ، فإنهم أكثر الناس صوابا ».

" دەست بگرن بە هاوەڵانی حەدیس ، لەبەر ئەوەی ئەوان لە هەموو خەڵک ڕاستترن ".

طبقات الشافعيين لابن كثير

٦٦. قـــالــ الشَّـعْـبِـيَّ :

" إِذَا سَمِـعْـتَ شَيْـئـاً ؛ فَاكْـتُـبْـهُ ، وَلَـوْ فِـي الْحَـائِـطِ ".

شەعبـی فەرموویەتـی :

" گـەر گـوێت لە شتـێ بـوو ؛ بینـووسـه ، گـەرچـی لـەسەر دیـواریـش بـێ "

' العلـمـ لأبـي خيثـمة، صـ | ٣٤

---

٦٧. الربيع دەڵێت، گوێم لە ئیمامی الشافعي بوو دەی فەرموو:

«بەتواناترین کەس بۆ داواکردنی زانست هەژارەکانن » .

|[ مناقب الشافعي للآبري (٨٢) ]|

---

٦٨. ئیمامـی شافعی دەفەرموێت :-

کـێ پێی خۆشه کەوا الله دڵی بـکاتەوه و دانای پێببەخشێت ، ئەوا با دەستبگرێ بە خەلوەت ، وه کەم خواردن ، وه تەرککردن و دوورکەوتنەوه لە تێکەڵاوی خەڵکی بێ عەقل وەهەندێک ئەهلی عیلم ئەوانەی کە نە ئینصافیان هـەیە نە ئـەدەب

مناقب الشافعي" للبيهقي ٢/ ١٧٢

---

٦٩. پرسیار کرا لە ئیمام شافعی (رحمه الله):

گومانی خراپ بە الله چۆنە ؟

فەرمووی: بە وەسواسی، وە ترسی هەمیشەیی لە ڕوودانی موسیبەت، وە چاوەڕوانی نەمانی نیعمەت، ئەم شتانە هەمووی لە گومانی خراپە بە زاتێکی بەخشندەی میهرەبان.

سُئل إمامنا الشافعي (رحمه الله): كيف يكون سوء الظن بالله ؟

قال: الوسوسة، والخوف الدائم من وقوع مُصِيبَة، وترقب زوال النعمة، كلها من سوء الظن بالرحمن الرحيم.

حلية الأولياء ج (٩) ص (١٢٣).

---

٧٠. [مَثل الَّذي يطلبُ العِلم بِلا حُجَّة]

◉ قال الإمام الشَّافعي: «مَثل الذِي يَطلب العِلم بِلا حجَّة كمَثل حاطبِ ليلٍ؛ يَحمل حِزمَةَ حطبٍ وفِيه أفعَى تَلدغه وهو لا يَدري»

◉ ئيمامی شافعی دەفەرموویت: «نموونەی ئەو كەسەی فێرخوازی عیلم دەكات بەبێ بەڵگە وەكو كەسێكە دار بە شەو كۆدەكاتەوە، دارێک هەڵدەگرێت ماری تیایە پێیوەئەدات ئەویش ئاگادار نیە»

كتاب مناقب الشافعي (٢/١٤٣)

---

٧١. قال الإمام الشَّافعيُّ:

«ليس العلم ما حفظ، إنما العلم ما نفع»

◉ ئیمامی شافعی دەفەرموویت:

«عیلم لەبەركردن نیە، عیلم سوود وەرگرتنە»

حلية الاولياء (٩/١٢٣)

---

٧٢. أحمد بن حنبل الشيبانی دەفەرموێت :

هەركەس پێی وابێت لە قیامەت الله نابینرێت كافرە.

مسائل أبو داود ١٧٠٠

---

٧٣. إمام أحمد (رحمه الله) فەرموویەتی:

لە براكەت خۆشبە، چ قازانجێكت دەست دەكەوێت گەر الله بە بۆنەی تۆوە عەزابی برا موسڵمانەكەت بدات ؟!

٧٤. ئیمامی أحمد دەڵێ:

لەسەر موسڵمان نییە ئامۆژگاری دیانەکان بکات بەڵکو لەسەریەتی ئامۆژگاری موسڵمان بکات.

پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی:

هەموو موسڵمانێک ئامۆژگاری لەسەرە، دەبێ ئامۆژگاری کۆمەڵی موسڵمانان و عەوامەکانیان بکات.

جامع العلوم والحكم (٢١١)

٧٥. لە ئیمامی أحمد ــەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی:

ڕەوشت جوانی ئارام گرتنە بەرامبەر ئەوانەی لە خەڵکەوە توشت دەبن.

جامع العلم والحكم (٤٦٥)

٧٦. ئیمام ئەحمەدی کوری حەنبەل( ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت)

دەفەرمووێت: تەقلیدی من مەکەنەوە، نە تەقلیدی مالک و نە شافیعی و نە ئەوزاعی نە ثەوری بکەنەوە، بەڵکو لەو شوێنە دینتان وەرگرن کە ئەوان وەریان گرتووە (کە قورئان و سونەتە).

(لا تقلدني ولا تقلد مالكا ولا الشافعي ولا الأوزاعي ولا الثوري وخذ من حيث أخذوا)

الاعلام لابن القيم ٢/٣٠٢

٧٧. ئیمام احمد دەڵی:

خشوعی ئەهلی بیدەع هەڵتان نەخەڵەتێنێت، وە بە نزم کردنەوە و تەوازوعی سەریان فریو مەخۆن، وە فریو مەخۆن بە زۆری نوسین و

کتێبی پارێزراو لایان، هیچ ڕێز و کەرامەتێکیان نییە، وە لەبەر چاویشتان هیچ ڕێزێکیان لێ مەگرن و بەڕێز باسیان مەکەن.

طبقات الحنابلة (١ / ٢٣٤)

---

٧٨. « بِئسَ العَيشُ أَنْ يحيَا الجَسد ويَمُوتَ الدِّين»

واتە: بەدبەختە جەستە بژی و دین بمرێت.

ئیمامی ئەحمەد بن حەنبەل - ڕەحمەتی خوای لێ بێت

---

٧٩. الإمام أحمد کوڕی حنبل

دەفەرمووێت:

ئەگەر پیاو ئافرەتێکی خواست با یەکەم شت کەپرسیاری بۆبکات جوانی ئافرەتەکەبێت، ئەگەر بەدڵی بوو با پرسیار لەدینی ئافرەتەکە بکات ئەگەر بەدڵی بوو با هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، بەڵام ئەگەر بەدڵی نەبوو با ڕەتی بکاتەوە لەبەر دینەکەی، با یەکەم شت کەپرسیاری بۆ دەکات دینەکەی نەبێت، ئەگەر بەدڵی بوو، پرسیار لەجوانیەکەی بکات و بەدڵی نەبێت و ڕەتی بکاتەوە لەبەر جوانیەکەی{کەبەدڵی نیە}.

[الإنصاف_للمرداوي_١٢_٢٠٦ ]

---

٨٠. پرسیار کرا لە ئیمام أحمد

دەربارەی قەومێک کار ناکەن و دەڵێن تەوەککول مان بە اللهِ یە ، فەرمووی : ئەوانە موبتەدیعن (بیدعەچین).

(٤٣٠) " " مسائل صالح.

---

٨١. قال الإمام أحمد:

حدثنا عبد الله، حدثنا عبيد الله بن عمر، حدثنا ابن مهدي، حدثنا قرة، عن أبي عبد الله -يعني عوناً- قال:

أَبُو ذَرٍّ [رضي الله عنه]ووتـی:

«ئایا خەڵکی ئەبینیت؟!زۆربەیان ! هیچ خێریان تیا نیە، جگە لە الله پەرستێک یاخود تەوبەکارێک»

[#کتاب_الزهد، لأحمد بن حنبل (رقم:٧٩٢)]

---

٨٢. خۆشبەختی بۆ کەسێک کە نەناسراوە

مامی ئیمام احمد-رحمه الله-

هاتە ژوورەوە بۆلای ئیمام احمد و دەستی خستە سەر شانی و پێی وت:ئەی کوڕی برام چ شتێک شایەنی ئەو خەمەیە!!

چ شتێک شایەنی ئەو بێتاقەتیەیە!!

ئیمام احمد سەری بەرز کردەوە و فەرمووی:مامە خۆشبەختی بۆ کەسێک کە خوای گەورە لەبیری خەڵکی بردۆتەوە.

"مقدمة الجرح والتعديل ١-٣٠٦"

ئیمام احمد دڵتەنگ بوە چونکە لە نێوان خەڵکی ناسراو و بەرچاو بوە، تەمەننای ئەوەی کردوە لەبیری خەڵکی بچوایەتەوە و خەڵکی نەیان ناسیایە.

---

٨٣. پرسیار کرا لە ئیمام احمد : من ئیماندارێکم وە دان بەوە دادەنێم کە نوێژ فەرزە و واجبە ، بەڵام نوێژ ناکەم

ئیمام احمد فەرمووی : سێ ڕۆژ ئیستیتابە دەکرێت ، ئەگەر نوێژی کرد باشە ، گەرنا دەکوژرێ .

٨٤. ئیمامی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

ئارام گرتن لەسەر هەژاری ، پلەیەکە تەنها گەورەکان پێی ئەگەن.!

كتاب البداية والنهاية ١٤/٣٩٢

---

٨٥. وتم : شەهید دەشۆردرێت؟

ئیمام أحمد فەرموی : گەر لە ڕوبەڕوو بونەوەدا مرد ناشۆردرێت

ئیسحاق فەرموی : وەک ئەوەی وتی.

مسائل الكوسج ٨١٨

---

٨٦. عبد الله ی کوڕی ئیمام احمد دەڵێ:

باوکم هەموو هەفتەیەک دوو خەتمی قورئانی دەکرد دانەیەکیان بە شەو بوو، ئەوی تریان بە ڕۆژ.

[ طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى : ٩/١ ]

---

٨٧. کابرایەک پرسیاری کرد لە (ئیمام احمد) ووتی دروستە نوێژ لە پشت ئیمامێکەوە بکەم ئەڵێ رمضان پێش نوێژیتان بۆ ئەکەم بە ئەوەندەو ئەوەندە درهەم؟! , ئیمام احمد فەرمووی: داوای سەلامەتی لە خوای گەورە ئەکەین ، جا کێ هەیە نوێژ لە پشت شتی وەهاوە بکات؟!

جا هەرچەند ئەم قەولە ئەخوێنمەوە صۆفی و دەروێشەکانی ئەم سەردەمە یەنە بەرچاوم کە ڕێگری نەبووایە لێیان لەوانەیە باج و زەریبەیان لەسەر خەڵکی دابنایە لەسەر نوێژی جمعەو جەماعەت و نوێژو و ڕۆژووی ڕەمەزانیش ..

مَسَائِلُ أحمد لأبِي داود صـ:٦٣

---

٨٨. مەروذی ئەفەرمووێ: گوێم لێ بوو ئیمام احمد ئەیفەرموو: «قەرز کردن سەرەتاکەی خەمەو کۆتاییەکەی شەڕە».

الجامع لعلوم الإمام أحمد - (الفقه ٢٩٩/٩)

---

٨٩. تەنانەت نینۆکەکانیشی !

ئیمام ئەحمدی کوڕی حەنبەل ئەفەرمووێ: " هەموو شتێک لە ئافرەتدا عەورەتە هەتا نینۆکەکانیشی ".

«أحكام النساء للإمام أحمد - رواية الخلال صـ ٣٢-٣٣»

---

٩٠. ئیمام ئەحمەد ی کوڕی حەنبەل لە دوعاکانیدا ئەیفەرموو: " یا رب چۆن ڕوخسارمت پاراستووە لە سوجدە بردن بۆ غەیری تۆ ،, ئاواش بیپارێزە لە داواکاری و تەکلیف کردن لە غەیری خۆت ".

مجموع رسائل ابن رجب مـ ٣ , صـ ١٢٣

---

٩١. « ئارەزووی شتێک ئەکەم کەناکرێت " ناگونجێت " ئارەزووی شوێنێک ئەکەم کە هیچ کەسی تیانەبێت».

امام احمد

| سير اعلام النبلاء | ١١/٢٢

---

٩٢. |امام احمد فەرمویەتی|

«واجبە لەسەر برا نەفەقەی خوشکەکانی بدات ئەگەر موحتاج بوون».

زاد المسافر ٣٠٩٠

---

٩٣. ئیمام ئەحمد ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەیفەرموو: "ئارام گرتن لەسەر هەژاری" پلەیەکە تەنها گەورەکان پێی ئەگەن ..

البِداية والنّهاية ١٤/٣٩٢

---

٩٤. وەفاو خۆشەویستی ڕاستەقینە بەو جۆرەیە

ئیمامی احمد چل دانە ساڵ لە نوێژەکانیدا دوعای بۆ ئیمامی شافعی کردووە ، جارێک ئیمام احمد بە محمد ی کوڕی امام شافعی دەڵێت باوکت یەکێکە لەو شەش کەسەی کە هەموو بەیانییەک دوعای بۆ ئەکەم , وە ئەیفەرموو پێنج کەس لە دوای هەموو نوێژێک دوعای بۆ ئەکەم یەکێکیان ئیمامی شافعییە

سیر أعلام النبلاء | ٧/٤٨٥

---

٩٥. بەرگری کردن و سەرخستنی برای موسڵمان واجبەو تەعبیرە لە سەرخستنی ئیسلام

لەو کاتەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حنبل تووشی تاقیکردنەوەکەی بوو , بە بشر بن حارث الحافي ووترا: تا ئێستە ئیمام ئەحمەد حەڤدە قامچی لێ دراوە لەلایەن پاسەوانەکانەوە لە زیندان ، بشر هەردوو پێی ڕاکشان و تەماشای کردن و فەرمووی: چەند ناشرینن ئەم دوو پێیە گەر کۆت و زنجیری پێوە نەبێت بۆ سەرخستنی ئەو پیاوە ..

المناقب:١١٩

---

٩٦. ئەڵێن ئیمام احمد جاری وا هەبوو ئەوەندە زوو لە ماڵ دەچووە دەر بۆ وەرگرتنی علمـ و زانست دایکی پێی فەرمووە: کوڕم جارێ با مامۆستاکانت لە خەو هەستن ..

ابن حنبل ,, صـ ٢٣

---

٩٧. ئیمام احمد بن حنبل رحمە اللہ دەفەرموویت:

لە براکەت ببوورە و لێی خۆشبە، چی سوودێک ئەبینی لەوەی اللہ تعالی سزای بدات بە هۆی تۆوە.!

سیر اعلام النبلاء _ (٢٦٢\١١)

---

٩٨. پرسيار كرا له ئيمام احمد : من ئيمانداريكم وه دان بەوه دادەنيم كه نويژ فەرزه و واجبه ، بەلام نويژ ناكەم

ئيمام احمد فەرمووى : سێ رۆژ ئيستيتابه دەكريت ، ئەگەر نويژى كرد باشه ، گەرنا دەكوژرێ .

{ احكام اهل الملل ١٣٩٨ )

---

٩٩. قال الإمام أحمد بن حنبل -رحمه الله-: «إذا مات أصدقاء الرجل، ذلَّ».

ئیمامی ئەحمەد کوڕی حەنبەل -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- فەرموویەتی: «ئەگەر پیاو هاوڕێ ودۆستەکانی بمرن ،ئەوە بێ کەس وکەساد دەبێت».

[طبقات الحنابلة ٢ / ٣٦]

---

١٠٠. محمد بن اسحاق بن إبراهيم الحنظلي گووتى :- گويم له باوكم بوو دەيگووت :- احمد بن حنبل حوجەيه له نيوان الله و بەندەكانى لەسەر زەوى

طبقات الحنابلة

---

١٠١. ووترا به ئيمام احمد كوڕى حنبل رحمه الله

نێوان ئێمەو عەرشى الله تعالى چەنده ؟

"فەرمووى:

نزايەكى ڕاستگۆيانەيه له دڵێكى ڕاستگۆوه"

مسائل ١/١٥٨

---

١٠٢. ئيمام ئەحمەد"رحمه الله"فەرمووى:

من داوايـــ عيلم ئەكەم تا ئەچمه ناو گۆڕ.

[شرف أصحاب الحديث ١٣٨]

١٠٣. كاتێك پرسياركرا له |ئيمامی أحمد|

كۆمەڵی ڕزگاربوو كێن..!

فەرمووی:

ئەگەر ئەهلی فەرمووده «شوێنكەوتوانی فەرمووده» نەبن نازانم كێن.

رواه الحاكم فى علوم الحديث'١' والخطيب في شرف أصحاب الحديث'صـ٢٥'

١٠٤. ئيمامی سُفيَـان الثّوري -رحمه الله - دەفەرمووێت :

" إياك والغيبة ، إياك و الوقوع في الناس ، فيهلك دينك " .

واتا : ئامان ورياى غەيبەت به ، ئامان وريايی قسەوتن به بەخەڵكی ، چونكه دينەكەت له ناو دەبات .

[ التوبيخ والتنبيه للأصبهاني ١٧٤ ]

١٠٥. ئيمامی سفيان الثوري دەفەرمووێت:

مەلائيكەتەكان سەربازی ئاسمانن، وه هاوەڵانی حەديثيش سەربازی زەوين.

شرف أصحاب الحديث للخطيب (٤٤)

١٠٦. تل بن سليمان ( سفيان الثوري رحمة الله دەيفەرموو: ئەگەر لەتوانات ـدا

هەبووسەرت نەخورێنيت ئيللا به ئەثەری سەلەف نەبێت ئەوه وا بكه. ( الجامع لآخلاق الراوي وآداب السامع) ١٧٩

١٠٧. سفيان الثورى دەڵێت :

هيچ پياوێك نيه لەدونيا شتێكى پێبدرێت ئيلا پێى دەوترێت: ها بيگره وه بەهێندەى ئەوەى كه وەرتگرتوه خەفەتيش هەڵبگره.!

حليه الاولياء

---

١٠٨. سفيان بن عيينة دەڵێ:

سفيان الثوري م بينى له خەو پێم گووت: ئامۆژگاريم بكه، پێى گووتم: ناسينى خەڵک كەم بكەوه بۆ قيامەتت.

المنامات لابن أبي الدنيا (٤٤)

---

١٠٩. واز له مونافەسەى دنيا بهێنه و پێشبڕكێى قيامەتيان لەگەڵ بكه !!

ئيمامى " سفيان الثوري " - رحمه اللّٰه تعالى - ئەڵێت :

[ ئەو مەليک و پادشا و سەرۆک و دەسەڵات دارانه قيامەتيان بۆ ئێوه تەرک كردووه و وازيان لێهێناوه ، ئێوەش دنيا يان بۆ تەرک بكەن و وازى لێ بهێنن ]

سەرچاوه : سير أعلام النبلاء ( ٧/٢٧٨)

---

١١٠. ئيمامى سُفيَـان الثّوري -رحمه الله - دەفەرمووێت :

" إياك والغيبة ، إياك و الوقوع في الناس ، فيهلك دينك " .

واتا : ئامان ورياى غەيبەت به ، ئامان وريايى قسەوتن به بەخەڵكى ، چونكه دينەكەت له ناو دەبات .

[ التوبيخ والتنبيه للأصبهاني ١٧٤ ]

سفيان الثوري فەرموويەتى : ئەگەر پێت گەيشت دەربارەى پياوێک له ڕۆژهەلات كەوا اهلى سوننەيه وەپياوێكى تر كەوا له ڕۆژئاوايه،

ئەوا سەلامیان پێ بگەیەنەو دوعایان بۆ بکە ، ئای چەندە کەمن اهلی سوننەو جماعە .

---

١١١. سوفیانی ثەوری –(ڕەحمەتی خوای لێبێت)فەرموویەتی :

«هیچ شتێکم چارەسەر نەکردووە ناخۆشتر و قورستر بێت لەچارەسەرکردنی نەفسم ؛ جارێکیان ئەو بەسەرم زاڵ دەبوو وە جارێکیان من . »

سیر_أعلام_النبلاء_٧_٢٥٨

---

١١٢. سفيان الثوري

أبو بكر المروذي(٢٧٥هـ) ڕیوایەتی کردووە لە ئیمام أحمد(٢٤١هـ) وتویەتی: ئەزانی کێ ئیمامە ؟

سوفیانی الثوری ئیمامە ، هیچ کەس پێشی ناکەوێت لە دڵمدا .

وَرَوَى: المَرُّوْذِيُّ، عَنْ أَحْمَدَ بنِ حَنْبَلٍ، قَالَ:

أَتَدْرِي مَنِ الإِمَامُ؟ الإِمَامُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، لاَ يَتَقَدَّمُهُ أَحَدٌ فِي قَلْبِي.

[ سير أعلام النبلاء ط الرسالة، ٧/٢٤٠ ].

---

١١٣. سەردەمێک دێت بەسەر خەڵکیدا دڵەکان تیایدا دەمرن و لاشەش تیایدا زیندوو!

سوفیانی ثەوری'رحمه الله'،حلية٢/٣٢٧

---

١١٤. [ ئەوەی وتراوە لە غەریبی طالب العلم ]

- لە سُفْيَانی الثَّوْرِيِّ دەڵێ: پێم گەشتوە وَاللَّهُ أَعْلَمُ وتراوە :

«ڕۆژانێک دێت بەسەر خەڵكیدا هەركەس طلبی علم كات غەریبە بێت لەوزەمانە

[البدع لإبن وضاح]

---

١١٥. سوفیانی سەوری رحمە الله ئەیفەرموو: پێویستە لەسەر پیاو زۆر لە منداڵەكەی بكات و هانی بدات بۆ فێربوون و هەوڵدان بۆ علمی شەرعی ، چونكە ئەو باوكە بەرپرسە لە پەروەردەی ئەو منداڵە.

السير | ٢/٧

---

١١٦. سفیانی الثوري - رحمە الله تعالى - دەفەرموێت:

"جاران خەڵكی كاتێك بە یەک دەگەیشتن سوودیان لە یەكتر وەر دەگرت، بەلام ئەمڕۆ ئەو شتە نەماوە بەڵكو دەرباز بوون لەوەیە كە واز لە خەڵک بهێنیت "

" كان الناس إذا التقوا انتفع بعضهم ببعض ، فأمَّا اليوم فقد ذهب ذلك والنَّجاة في تركهم "

[ من : رسالة سفيان_الثوري إلى #عباد_بن_عباد ]

---

١١٧. سفیان الثوري - رَحِمَـهُ الله - فەرموویەتـێ :

دڵخۆشمـ كە شـەو دادێت ، تەنـها لەبەرئـەوەی ئیسـراحـەت بكـەمـ لە بینـینـی خـەڵكـی!

" إنـي لأفـرح إذا جـاء اللَّـيـل ، ليس إلا لأسـتـريـح مـن رؤيـة النَّــاس ! ".

حلـية الأولـيـاء - ٣٩٠

---

١١٨. خەیاتێـک هات بۆ لای سوفیان ثوري -رحمه الله- پێی ووت :

من جلەکانی پاشا ئەدوورم ئایا من سەرخەری زاڵمەکانم...؟

سوفیان فەرمووی : نەخێر تۆ خۆت زاڵمەکەی، سەرخەران ئەوانەن کە دەرزی و دەزووەکەت بۆ دێنن .

" الزواجر عن اقتراف الكبائر " ٢ : ١٣١

---

١١٩. سوفیانی_ثەوری_رحمه الله_فەرمووی :

نابینم هیچ کردەوەیە باشتر بێت لە داواکردنی عیلمی شەرعی ،وەلەبەرکردنیشي بۆ ئەو کەسەیە کە الله تعالی خیری بوویت بۆی.

وەهەروها فەرموویەتی :هیچ کردەوەیەک لەدوای فەرزەکان چاکتر نیە لە داواکردنـے زانستی شەرعی.

(شرح السنة للبغوي - جـ ١ - صـ ٢٧٩).

الشافعيُّی_رحمه الله_فەرموویەتی :

داواکردنـے عیلمی شەرعی باشترە لە نوێژە سوونەتەکان.

حەسەنی_بن_صالح_رحمه_الله-:

فەرمووی: خەڵکـے پێوستیان بەم عیلمە دەبێت بۆ دینەکەیان ،وەک چۆن پێوستیان بە خواردن وخواردنەوەیە لە دونیایەکەیان.

---

١٢٠. سفيان الثوری دەڵێت :

ڕەحمەتی الله لە أبا حازم بێت دەیفەرموو : خەڵکی ئەمڕۆ ڕازین بە عیلم و وازیان لە عەمەل کردن هێناوە.

العلل_ومعرفة_الرجال_٢٦٥٩

---

١٢١. سوفیان دەفەرمویّت :

طَاوُسٌ دانیشتبوو لەماڵکەی خۆی نەدەچوە دەر ، لێیان پرسی بۆچی؟

فەرمووی : « بەهۆی ستەمی دەسەڵات داران ، خراپی خەڵکی»

[أبو نعیم الأصبهاني، حلیة الأولیاء وطبقات الأصفیاء، ٤/٤]

---

١٢٢. دڵخۆشیت وە زەردەخەکانت کەم بکەرەوە

بەوەی کەتوشت دەبێ لەدونیایا هێزت زیادەکات لەلای الله تعالیٰ

کار بکە بۆ ئاخیرەتت الله کاری دونیات تەواو دەکات «ئاسان دەکا»

نهێنیەکانت باش بکە الله تعالیٰ ئاشکراکانت باش دەکات

بگریٰ لەسەر تاوانەکانت دەبیتە یەکێک لەئەهلی هاوڕێیانی پلە بەرزەکان

لە بێ ئاگایان مەبە چوونکە الله تعالیٰ هەرگیز لێت غافڵ نابێ

| سوفیانی ثەوری | ڕەحمەتی الله،ـی لێبێت

حلیة الأولیاء | ٨٢/٧

---

١٢٣. سفیان الثوری بەلای کەسێکدا تێپەڕی کاتبی کاربەدەستێک بوو سفیان ئامۆژگاری کرد واز لەو کارەی بهێنێ کابراش گوتی: ئەی چی لە منداڵەکانم بکەم !!

سفیانیش بەو خەڵکەی گووت کە لەگەڵی بوون : گویٚ لەمە بگرن ، دەڵێ ئەگەر سەرپێچی الله بکەم الله رزقی منداڵەکانم دەدات بەڵام گوێڕایەڵی فەرمانی الله بکەم الله ڕزقی منداڵەکانم نادات!!

زۆرمان دی بۆ پارە و پول خۆیان دەکەن بە دارا.

[حلية الأولياء الأبي نعيم : ٦ / ٣٨٠]

١٢٤. سوفیانی ثەوری -رحمە الله- فەرموویەتی:

« هیچ شتێک ناگات بە هاوڕێ لە فەسادکردن و چاکسازکردنی پیاودا »

( الإبانة الكبرى لإبن بطة العكبري (٥٠٤/١) )

١٢٥. ابن مسعود دەفەرموێت:

بەشێک لە ئیمان ئەوەیە پیاوێک پیاوێکی خۆشدەوێ بەڵام هیچ نزیکایەتیەکی خوێنی نییە لە نێوانیان، وە لەبەر پارەش نییە کە پێی دابێت، تەنها لەبەر الله خۆشیدەوێت.

السنة لِلخلال (١١٨٦)

١٢٦. إبن مسعود دەفەرموێت:

علم بە زۆری ڕیوایەت نییە، بەڵکو علم لە الله ترسانە، وەک الله تعالى فەرموویەتی: (( إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ )).

أخرجه أحمد في الزهد (١٥٨)

١٢٧. عبداللهی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەڵێت: "بەشێکە لە ئیمان: کە پیاوێک پیاوێکی خۆشدەوێت کە هیچ ڕەچەڵەکێکی نزیک (خزمایەتی) لە نێوانیاندا نییە ، نە پارەیەک کە پێی بەخشیوە، تەنها لەبەر الله تعالى خۆشی دەوێت".

قال ابن مسعود رضي الله عنه : «إن من الإيمان: أن يحب الرجلُ الرجلَ ليس بينهما نسبٌ قريب، ولا مال أعطاه إياه، لا يحبه إلا لله»

كتاب السنة | لأبي بكر الخلال ٦٠٠/١

١٢٨. إبن مسعود ئەڵێت :

ئیماندار ئیسراحەت ناکات هەتا بەلیقای الله ﷻ نەگات.

#كتاب_الزهد_لأحمد_٨٤٦

---

١٢٩. إبن مسعود (رضي الله عنه) دەڵێ:

ئەگەر خەڵکی کەوتنە خراپە، بڵێ: من هیچ پێشەوایەکم نییە لە خراپەدا، نەفسی خۆت ڕابێنە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر هەموو خەڵکی کافر بوون من کافر نابم .!

الإبانة الصغرى لإبن بطة.

---

١٣٠. ابن مسعود (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ:

هەرگیز پەلە مەکە لە مەدح کردن و زەم کردنی خەڵك چونکە لەوانەیە ئەوەی ئەمڕۆ لێی دڵت پێی خۆشە بەیانی خراپ دەرچێت.

شعب الإيمان (٦١٧٧).

---

١٣١. "گەر زانستان دەوێت، دەست بگرن بە قورئانەوە، چونکە زانستی دونیا و ڕۆژی دوای تێدایە".

ابن مسعود (رحمه الله)

---

١٣٢. ئیـبن مسـعود"ڕەزای خوای لێبێت"

دەفەرمــــوویـت: [«ئیـخلاس بـۆخودا وەکو ڕۆیشتن وایـەلەسەرلـم، دەنگـی نایــەت بەڵام شوێنەواری دەمێنێتـــــــەوە»]

محمد محى الدين عمر #حەنبلی

---

١٣٣. (کارکردن بە قورئان لەکوێ و خوێندنەوە لەکوێ)

إبن مسعود ڕەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێت:- لەبەرکردنی قورئان لەسەردەمی ئێمە زۆر قورس بوو، بەڵام کار پێکردنی ئاسان بوو.!

بەڵام ئەوانەی دوای ئێمە لەبەرکردنیان لا ئاسان دەبێت کار پێکردنیان لا قوڕس دەبێت.

الجامع لأحكام القرآن ص ٦٩

---

١٣٤. ابن مسعود دەڵێ :

جنۆکەکان ناچنە ماڵێک کە ئەسپی جیهاد تێیدا بێت

مشارع الأشواق للنحاس (٥١٠)

---

١٣٥. ئەوانە ئاوا فێری عیلم ئەبوون !'

إبنُ مسعود ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ فەرموویەتی :

ئێمە لە پێغەمبەری خواوە ـ صَلـَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلـَّمَ ـ فێری دە ئایەت ئەبووین نەئەچووین بۆ دە ئایەتی تر هەتا هەموو عیلم و عەمەلێکی ناو ئەو دە ئایەتە فێردەبووین .

" كنـَّا نتعَلم مِن رسول الله ـ صَلـَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلـَّمَ ـ العَشرَ فلا نجاوِزُها إلى العَشْرِ الأُخَر حتىٰ نعلمَ ما فيها من العلمِ والعمل "

زاد المسير في علم التفسير

---

١٣٦. نَقاوةُ المسلمينَ ، وَهُمْ خَيرُ الناسِ لِلناس ..

ئەهلی سوننە پاکترین و چاکترین ئوممەتن خێردارترین خەڵکن بۆ خەڵکی

||ئیبنو تەیمیە، اللهـی لێ ڕازی بێت وای فەرمووە ..

||منهاج السنة النبوية"٥/١٥٨

---

١٣٧. شێخ ابن تیمه "ڕەحمەتی خوای لێ بێ " دەفەرمووێ :

لە دونیا بەهەشت هەیە، ئەوەی نەچێتە ئەم بەهەشتە ناچێتە بەهەشتی کۆتایی

پێیان وت : ئەوە چیە ئەی ئیمام ..؟

فەرمووی : خۆشەویستی خوا و زیکرو یاد کردنی.....!!

---

١٣٨. شێخی ئیسلام ابن تیمییە ـ ڕەحمەتی خودای لێبێت ـ دەفەرموێت :-

هەرکەسێک نزا بکات و بپاڕێتەوە لەخودای گەورەو هانای بۆبەرێت لەبەرەبەیاندا وەبڵێت :

ئەی هەمیشە زیندوو هەڵسوڕێنەری بونەوەر ، هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لەتۆ ، بەڕەحمەت و بەزەیی خۆت داوات لێدەکەم ،

خودای گەورە تواناو هێزێکی پێدەبەخشێت هیچ کەسێک پێنازانێت تەنها خودا نەبێت .

جامع المسائل (٧/٤٤٦)

---

١٣٩. لە گەورەترینی پیسییەکانی دڵ ئەوەیە ڕق و کینەت بەرامبەر بڕوادارە چاکەکان هەبێت

ابن تیمیة (رحمه الله ) [ منهاج السنة ١/٢٢ ]

---

١٤٠. قال شـيخ الإســلام ابنُ تيـميـة الحــراني رحمه الله :

" لو خالف العبد جميع الخلق واتَّبع الرسول ما سأله الله عن مخالفة أحد."

"ئەگەر بەندە پێچەوانەی هەموو خەڵکی بکات ، بەڵام شوێن پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بکەوێت ، لە دوارۆژدا خوای گەورە پرسیاری لێناکات بۆ پێچەوانەی ئەوان و( هەموو خەڵك )ی کردووە !

مجموع الفتاوى لابن تيمية رحمه الله : ١٦ / ٥٢٩

---

١٤١. حسنی البصري رحمه اللّٰه دەفەرموێت :

کاتێک ئەهلی بەهەشت سەیری الله دەکەن ئەوا خۆشیەکانی بەهەشتیان بیرەچێتەوە.

روضة المحبين (صـ٤٢٢)

دەلیلە لەسەر ئەوەی لەقیامەت الله دەبینرێ لەلایەن بەهەشتیەکانەوە

دەلیلە لەسەر ئەوەی هیچ شتێک خۆشتر نیە بۆ ئەهلی بەهەشت وەک بینینی الله

---

١٤٢. أَبِي خَلِيفَةَ دەفەرمووێت:

حسن البصري خۆی لەماڵەکەی شاردبۆیەوە، شەوێک بەخەبەر بووم لە شەودا هەستم کرد حسن بە کوڵ دەگریا، پێم گووت: چی تۆی گریاند ؟ ئیمام گووتی: تاوانێکم هەیە بیرم کەوتووەتەوە بۆیە گریام.

التوبة لإبن أبي الدنيا (١٥٥)

---

١٤٣. حسن البصري دەڵێ:

دونیا گشتی لە سەرەتاوەی تا کۆتایی ئیللا وەک پیاوێکە سەر خەوێک دەشکێنێت لە خەویدا، چەند ساتێک خەوی خۆش دەبینێت دواتر بە ئاگا دێتەوە.

الحلية الأولياء (٦ / ٢٧٠)

---

١٤٤. حسن البصري دەڵێ:

هەر پیاوێک نیعمەتی الله تعالی ی بەسەر خۆیەوە بینی و گووتی: " الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات " ئیللا الله تعالی دەوڵەمەندتری دەکات بەم نیعمەتەی تێیدایە و بۆی زیاد دەکات.

الحلية الأولياء (١٨٥٧)

---

١٤٥. حسن البصري دەڵێ:

بۆ هەموو ئوممەتێک بتێک هەبوو کە دەیانپەرست، بەڵام بتی ئەم ئوممەتە دینار و درهەمە. (الأداب الشرعية (٢ / ٢٩٧))

١٤٦. پرسیاریان لە ئیمام حەسەنی بەسری ڕەحمەتی خوای لێ بێت کرد؛

ئەگەر ئیختیارت بدەنێ لە نێوان کردنی دوو ڕکات نوێژ یان چوونە بەهەشت کامیان هەڵدەبژێریت یەکەم جار؟

ئیمام حەسەنی بەسری فەرمووی:

دوو ڕکات نوێژەکە هەڵدەبژێرم یەکەم جار، ئینجا چوونە بەهەشت دووەم جار هەڵدەبژێرم .

وتیان لەبەر چی؟

فەرمووی: چونکە کردنی دوو ڕکات نوێژەکە بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە بەڵام چوونە بەهەشت بۆ ڕەزامەندی نەفسی خۆتە، بەندەی ئاقڵیش ڕەزامەندی خوای گەورە پێش ڕەزامەندی نەفسی دەخات

---

١٤٧. له حهسهنهوه -ڕهحمهتی خوای لێبێت- فهرموویهتی: (ئهی ئههلی سوننه ڕهحمهتی خواتان لێبێت لهگهڵ یهکتریدا نهرمو نیان بن بهڕاستی ئێوه کهمترینی خهڵکین)

سهرچاوه: 【اللالكائي: ١٩/٥٧/١】

---

١٤٨. ئیمام الحسن البصري رحمهُ الله دهفهرموێت

« إنَّ الرجلَ يُذنبُ الذنبَ فَما يَنساه، وَما يزالُ مُتخوفًا مِنّهُ حتىٰ يُدخله الجنة؛ يعني مِن شدةِ النَّدمِ والتوبة ».

"کهسی وا ههیه تاوانێک دهکات وقهت بیری ناچێتهوه وبهردهوام له ترسایه بهرامبهر پهروهردگار ههتا ئهو تاوانه دهیخاته بهههشتهوه بههۆی زۆر پهشیمانی وتهوبه لێی"

الزهد لأحمد [١٦٠٤]

---

١٤٩. ئهی چی دهربارهی سهردهمی ئێمه؟!

موسای جوعفی له پێشهوا حهسهنی بهصری یهوه دهگێڕێتهوه که فهرمویهتی: گهشتم به ده ههزار هاوهڵ له هاوهڵهکانی پێغهمبهری خوا ﷺ ئهگهر ئێوهیان ببینیایه ئهیانوت ئهمانه کێن؟ شێت و بێ ئاگان؟! , ئهگهر گهنجهکانی ئێستهیان ببینیایه ئهیانوت ئهمانه هیچ بهشێکیان نییه له قیامهتدا ، خۆ ئهگهر پیرهکانیشیان دیبایه ئهیانوت ئهمانه بڕوایان بهڕۆژی پاداشت و سزا نییه ..

البدع والنهي عنها رقمـ١٥٧

---

١٥٠. حسن البصري رحمه الله دهفهرموێت:

"هیچ کهس نیه ، پاره گهوره و عهزیز تهماشاکات ئیلا الله زهلیلی دهکات عز وجل".

١٥١. دڵ رەشبوون بەهۆیی چیەوە.!!

قال الله تعالى: { كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ }

نەخێر، وانیە بەڵکو دڵیان ژەنگی هێناوەو چڵکی گوناه داپپۆشیوە لە سەرەنجامی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد.

قال الحسن البصري :

تاوان لەسەر تاوان - دەیکات -

تاوان لەسەر تاوان - دەیکات -

تا دڵی کوێر دەبێت ، پاشان دەمرێت...

#المخلصيات_١٧١٢

---

١٥٢. ئیمامی حەسەنی بەصری ڕەحمەتی الله ـی لێبێت فەرموویەتی:
«لە نێوان الله تعالی و بەندە سنورێك هەیە لە گوناهـ و تاوان ، ئەگەر بەندە پێی گەشت ئەوکات مۆر لەسەر دڵی ئەدرێت و ئەو بەندەیە هەرگیز مۆفەق نابێت بۆ کاری خێر».

- نسأل الله السلامة

|| قوت القلوب لأبي طالب المكي | ١/١٨٨

---

١٥٣. یونسی کوڕی عوبەید رحمه الله ئەی فەرموو: کەسم نەبینیوە وەک حەسەنی بەصری داییم خەمبارو بێ تاقەت بێت ،، وە هەموو جار ئەیفەرموو: «سەیرە ئێمە پێ ئەکەنیـن .. کێ ئەڵێ الله سەیری کردەوەکانمانی نەکردوە و نەی فەرمووە هیچیتان لێ قبوڵ ناکەم..!».

حلية الأولياء ٣/١٩

---

١٥٤. حسنُ البصريُّ رحمه الله ئەفەرمووێ: لە گەورەترین بەڵاو موصیبەتەکانی پیاو ئەوەیە کە بزانێت لە کارو کردەوەو نەفسیدا کەمە و کوڕی هەیە ، بەڵام گوێی پێ نەدات و خەمی لێ نەخوات تا چاکی بکات ..

شعب الإيمان | ٢/٢٧١

---

١٥٥. حەسەنی بەصری رحمه الله ئەیفەرموو: «تەوبە بکەن لەو زیادەڕەویانەش کە لە خواردن و زۆر خەوتن ـیش کردووتانە».

| آداب حَسَن البَصْري

---

١٥٦. حەسەنی بەصری دەفەرموێت لە راستگۆییە کەوا فێری دین ببیت و پاشان خەڵکیش فێر بکەیت

شرح مذاهب اهل السنة لابن شاهين

---

١٥٧. حه سه نی به صری رحمه الله ده فه رمووێت: ـ پیاو ئه وه یه کاتێك دڕکێك چووبه پێی دا، ده لێ: ـ ده زانم ئه مه به هۆی گوناحێکم چووه به پێمداو رب العالمين غه دری لێم نه کردووه

الزهد لامام احمد١٦٤٧

---

١٥٨. خوشکانی نیقاب پۆش و عابا

که وەسفیان دەکات به دەعبا

ڕیش تاشراوی عەینەك لەچاو

کەفی جۆگەی لەبەر هەتاو

خوشکانی من گوڵ و گەوهەرن

به عابا و نیقابیان بەختەوەرن

تۆی حاقید و گەمژە و داخ لە دڵ

دەمت داخە لەئاست خوشکانی گوڵ

دەیانەوێ خوا لە خۆیان بکەن ڕازی

بەسە کۆڵدەن لەتۆمەت و چەنەبازی

---

١٥٩. حسن بصری فەرموویەتی :

لەداهاتوودا کۆمەڵە سەرکردەیەک دێن کەوا خەڵکی بانگ دەکەن بۆ پێچەوانەی سوننەت، خەڵکیش شوێنیان دەکەون لەترسی ئەوەی کەوا ماڵ و دونیایان لەدەست نەچێت، بەڵام الله تعالی ئیمان لەدڵیاندا ناهێڵێت، وە هەژارییان تووش دەکات، وە صەبریان ناهێڵێت، وە هیچ پاداشتێکیان ناداتەوە.

[ الإبانة الصغرى ]

---

١٦٠. ئیبن قەییم ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێ : چاکترین ڕۆژی بەندە ئەو ڕۆژەیە کە تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە لای خوا.

[زاد المعاد (٣-٥٨٥)]

---

١٦١. ئەگەر دڵەکان لێک نزیک بن، دووری جەستە کێشە نییە.

ابن القیم

---

١٦٢. ابن القیم دەڵێ:

بەردەوام شوبوهاتم نەقل دەکرد بۆ شێخەکەمان، جا پێی گووتم: دڵت بەرامبەر شوبوهات وەک ئیسفەنج لێمەکە هەمووی هەڵبمژێ، بەڵکو وەکو جامێکی پتەوی لێ بکە، شوبوهات بە پشتیەوە تێدەپەڕێ، بەهۆی سافیەکەی بە جوانی دەیبینێ، بەهۆی بەهێزیەکەی بەرگەی دەگرێ ڕەتی دەکاتەوە.

ابن القيم دەڵێ: سوودم لە هیچ ئامۆژگارییەک نەبینی بۆ لابردنی شوبوهات وەک ئەم ئامۆژگارییە.

مفتاح دار السعادة (١/١٤٠)

---

١٦٣. ابن قیم {رحمه الله} دەفەرموێت: ئەو بنەمایەی کە دڵ و گیانی پێ پاک دەبێتەوە بریتیە لە تەوحید.

إغاثة اللهفان{١\١٠٨}

تەوحید ئەسڵ و بنچینە و ئەساسی ئەو دینەیەکە هەموو دینی لەسەر بینا دەکرێت، نە ئیمان بەدەست دێت و نە کردەوەش قەبوڵ دەبێ ئیلا بەبەدەست هێنانی ئەو تەوحیدە نەبێ{ئایە هێشتا هەوڵی فێربونی نادەی؟!} زۆریان فێرکردین کە دەست نوێژ بەچی بەتاڵ دەبێتەوە بەڵام فێریان نەکردین کە تەوحید چیەو چۆن تەوحید بەدەست دێت و چۆنیش و بەچ کردوەیەک تەوحیدەکەمان هەڵدەوەشێتەوە.

---

١٦٤. ڕێگەی حەق بگرە و دوو دڵ مەبە لە کەمی ڕێبوارانی

ابن قیم

---

١٦٥. ئیبن قەیم-رحمه الله-فەرمویەتی:

« هەرگیز هیچ دەرمانێک چارەسەر نی یە بۆ دڵەکان کە سودبەخشتر و سودمەنتر بێت لە قورئـان »

[ البَدائع في عُلوم القُرآن:٤١٣]

---

١٦٦. زانای پایەبەرز ابن القیم دەفەرمی چوار شت دەبنە هۆی ڕێگربوون لە رزق و رۆزی:

«خەوتنی بەیانیان ،کەمی نوێژ ،تەمبەڵی ،خیانەت »

قال ابن القيم رحمه الله:«أربعة تمنع الرزق :نوم الصبحة ،وقلة الصلاة ،والكسل ،والخيانة »

زاد المعاد ٤/٣٧٨

---

١٦٧. ابن قيم رحمه الله ده فەرموێت:

بەدوای دڵتدا بگەرێ لەم سێ شوێنە

"لەکاتی گوێگرتن لە قورئان

"لە کۆرەکانی زیکر "

" لەکاتەکانی تەنهاییدا "

ئەگەر لەم شوێنانە نەتدۆزییەوە..

ئەوا داوا لە الله سبحانە وتعالی بکە دڵت پێ ببەخشێت... چونکە تۆ دڵت نییە.!!

[ بدائع الفوائد ١ / ١٤٩ ]

---

١٦٨. ابن القيم - رحمه الله - ده فه رموويێت:-

ئاگاداری دوو دوژمن به كه زۆرێک له خەڵکی پێی به هیلاک چوونه :

یەکەم : ئەو کەسەی خەڵکی دوور دەخاتەوە لە ڕێبازی خوا بە گومان و قسەی سەرقۆزی بن ئالۆز .

دووەم : ئەو کەسەش کە فریوی خواردوە بە دنیا و ناوبانگ و دەسەڵاتەوە .

[ الفوائد ]

---

١٦٩. لەسەر زەوی هیچ شتێک هێندەی زمان پێویستی بە بەندیخانە نییە.

ابن القيم (رحمه الله)

---

١٧٠. هەر کەسێ سەرپێچی خوا بکات دوو سەربازی خوا بەسەریا زاڵ ئەبن :

١ ـ دڵ تەنگی

٢ ـ غەمباری

إبن القيم

---

١٧١. گەنجی تەوبەکار خۆشەویستی اللهیە جل جلاله

ابن القيم

الداء والدواء(١/٤٤٦)

---

١٧٢. ئیمامی ابن القیم: دەفەرمووێت

تەوحید گەورەترین قەڵایە ئەوەی بچێتە ژورەوە لە ئارامی و ئاسایشدا ئەبێ.

بدائع الفوائـــد (٢/٤٧٠)

---

١٧٣. ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەفەرموێت:

《 القلـق سببه المعاصـي》

واتـــە: دوو دڵی وقەلەقی هۆکارەکەی تاوانەکانن .

الداء والدواء ٢١

---

١٧٤. ڕێگای ڕاست ئەوەیە کە ئەهلی جیهاد لەسەرینە

ایمامی ابن القیم احمە الله دەفەرمووێت .. هەر بۆیە ئەوزاعی و ابن مبارک ئەیان فەرموو ئەگەر خەلکی رایان جیاواز بوو لەشتێکدا ئەوا باسەیری تێکۆشەرانی سەنگەرەکان بکەن چونکە الله تعالی فەرموویەتی :

[٦٩وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ ] وه ئەوانەش لە پێناوی ڕەزامەندی ئێمەدا هەوڵ و كۆشش و جیهادیان كرد، ئەوە بێگومان ئێمەش ئەوان ڕێنمایی دەكەین بۆ رێگای حەق..

#مدارج السالكين ١/٥٠٦

---

١٧٥. ابن القيم الجوزي رحمه الله دەفەرموێت:

( لەو لایەنە بە كـە پەروەردگار و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی تێدایە تەنانەت ئەگەر هەموو خەڵكی لە لایەنەكەی تر بـوون.!)

( الفوائد ص ١٦٧ )

---

١٧٦. لە دوعاكانت بڵێ یاحي یاقیوم

ئیمامی ابن القیم ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموێت : بەڕاستی ناوی ( الْحَيُّ الْقَيُّومِ ) كاریگەری هەیە بەتایبەت بۆ:گیرابوونی دوعا و هەڵگرتنی بەڵا

بۆیە پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم وەختێك كە كۆششی لە دوعای بكردایە دەیفەرموو:

« يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ» .

[ زاد المعاد(٤/١٨٩) ]

---

١٧٧. ئیمام ابن لقیم رحمه الله دەڵێت:

الرب سبحانه لا يمنع عبده المؤمن شيئًا من الدنيا ؛ إلا ويؤتيه أفضل منه ، وأنفع له ؛ وليس ذلك لغير المؤمن .

پەروەردگار هیچ شتێک لە بەندەكەی قەدەغە ناكات ، تەنها كاتێك نەبێت كە لەو باشتر و بەسودتری پێدەبەخشێت ، ئەمەش بۆكەسی تر نیە جگە لە برودار.

[ الفوائد : ٥٧ ]

١٧٨. ابن القيم دەفەرموێت :

دونيا دانراوە بۆ تاقيكردنەوە ، پێويستە لەسەر كەسى عاقڵ

خۆی پەروەردە بكات لەسەر صەبر و ئارام گرتن "

صيد الخاطر ١/ ٣٩٣

---

١٧٩. ئيمام ابن القيم - رحمه الله - دەڵێت:-

القلب كلما اشتدّت به الغفلة اشتددت به القسوة، فإذا ذكر الله ذابت تلك القسوة كما يذوب الرصاص في النار.

هەركاتێك دڵ زۆر بێئاگابوو ئەوە زۆر ڕەق دەبێت، وەكاتێك بەندە يادی خوای كرد ئەو ڕەقێتيەی دەتوێتەوە هەروەكو چۆن قوڕقوشم لەئاگردا دەتوێتەوە.

[ الوابل الصيب : ٧١ ]

---

١٨٠. پێشەوا ابن القيم - رحمه الله - دەفەرمووێت:-

إذا أذنب العبد المؤمن ، الموحد ، المتبع لسبيله ، وسنة رسوله ﷺ ؛ استغفر له حملةُ العرش ومن حوله.

كاتێک بەندەيەكی بڕواداری يەكخواپەرستی شوێنكەوتەی ڕێگای پەروەردگار و سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ تاوانی كرد : هەڵگرانی عەرش و ئەوانەش لە دەوری عەرشن داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكەن.

[ الداء والدواء : ١/٢٥٤ ]

---

١٨١. ابن القيم رحمه الله دەفەرمووێت:

ئەگەر بەندە گوناهو تاوانی گۆڕی بۆتاعەت و گوێڕایەڵی الله تعالی، ئەوا الله تعالاش سزاو عوقوبەی بۆ دەگۆڕێت بەسەلامەتی، وەلەزەلیلیەوە بۆ عیزەت.

(الداء والدواء ص:٧٣)

---

١٨٢. پێشەوا ابن القیم - رحمه الله - دەڵێت:-

قراءة آية بتفكر وتفهم خير من قراءة ختمة بغير تدبر وتفهم وأنفع للقلب وأدعى إلى حصول الإيمان وذوق حلاوة القرآن.

خوێندنی ئایەتێک بە ووردبونەوە و تێگەشتن چاکترە لە خوێندنی خەتمێک بەبێ تەدەبور و تێگەیشتن، وە بە سوودترە بۆ دڵ و یارمەتیدەرە بۆ بە دەست هێنانی ئیمان و چێژتنی شیرینی قورئان.

[مفتاح دار السعادة : ١/١٨٧]

---

١٨٣. حاتم کوڕی اصم رحمه الله ووتی ...

لەدەست چونی نوێژی بەیانی شتێکی گەورەیە بەڕاستی حەق وایە تەعزیەو دڵتەنگی و خەفەتباری بۆ دابنرێ ...

صلاح الأمة ٢/٤٢٠

---

١٨٤. پیاوێك هاتە لای حاتم ی أصم ووتی: ئەی أبو عبدالرحمن چ شتێك سەری زوهدە، وە چ شتێك ناوەندی زوهدە، وە چ شتێك کۆتایی زوهدە؟

حاتم فەرموی:

سەری زوهد ئەوەیە کە تۆ متمانەت بە خوا هەبێ.

ناوەندی زوهد ئەوەیە کە پەندو ئامۆژگاری وەربگریت.

کۆتایی زوهد ئەوەیە کە کار بە دڵ سۆزی بۆ خوا بکەیت.

---

١٨٥. ئیمامی زاهید " الفضيل بن عياض " ـ رحمه الله تعالى ـ ئەڵێت :

چەند عالم و زانا هەبوون چونە لای حاکم و مەلیک و دەسەڵات داران و لێیان نزیک بوونەوە دینیان پێی بوو ، بەڵام کاتێک لایان هاتنە دەرەوە و لێیان دوورکەوتنەوە هیچ شتێکیان لە دین پێ نەمابوو ....!!

واتە کەسانی زانا و دیندابوون پێش ئەوەی لە مەلیک و دەسەڵاتداران نزیک ببننەوە و بچنە ناودەسەڵاتەکەیان بەڵام کاتێک لێیان نزیک بوونەوە و چونە ناو دەسەڵاتەکەیان دینەکەیان لەدەستدا بەبێ دینی لێی دەرچوون .

سەرچاوە :

[ أخبار الشيوخ للحافظ المروذي ( ٨ ) ]

---

١٨٦. ئەبوبەکر مورِوەزی دەڵێت:

گوێم لە ئەحمەدی کوڕی یەزیدی خوزاعی بوو دەیفەرموو:

«خۆشەویستی ئەگەر لەپێناوی خوا نەبوو نامێنێ.»

[أخبار الشيوخ:١٩٧]٢٧٥

---

١٨٧. دەڵێن ئەگەر ئەم عەقیدەیەی ئێوە ڕاستە ئەی بۆ شێخ فڵان وشێخ فڵان وەک ئێوە ناڵێن

شێخ عبدالله أبا بُطَين رحمه الله دەفەرموێت "والإنسان إذا تبين له الحق، لم يستوحش من قلّة الموافقين، وكثرة المُخالفين، لا سِيَّما في آخر هذا الزمان وقولُ الجاهل: لو كان هذا حقاً ما خَفيَ على فلان وفلان، هذه دعوى الكفار في قولهم: (لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَا إِلَيْهِ ۚ).

مرۆڤ کەهەقی بۆ ڕۆشن بویەوە کەمی شوێنکەوتوانی هەق و وزۆری پێچەوانەکارانی هەق دڵی نارەحەت ناکات بەتایبەت لە کۆتایی ئەم سەردەمەدا

وە قسەی ئەو نەزانەش کەئەڵێت ئەگەر ئەوە حەق بوایە شاراوە نەدەبوو لای فلان وفلان

ئەمە بانگەشە وقسەی کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەربوو که دەیانوت: (ئەگەر باوەڕهێنان بەئیسلام چاک بوایە ئەوا ئەو موسڵمانانە پێش ئێمە نەدەکەوتن لە باوەڕهێنان پێی)

الدرر السنية ١٠/٤٠٠

---

١٨٨. سەرەتای تێکچوونی ڕەوشت .

عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ( خوا لێی ڕازی بێت ) دەڵێ : سەرەتای تێکچوونی ڕەوشت بەهۆی تێکەڵاوی کردنی کەسانی خراپەوەیە .

- سراج الملوك | ١٧٨

---

١٨٩. کەمێک_ماندوو_بە_زۆر_دەحەسێیتەوە .

ابن الجوزی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێ : ئەی نەفس کەمێک ماندوو بە لەدونیا ، زۆر دەحەسێیتەوە لەبەهەشت .

المواعظ ( ١/٧٩ )

---

١٩٠. جیاوازی_نێوان_ئیماندارو_کەسی_دووڕو

عبدالله ی کوڕی موبارەک ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێ : ئیماندار هەمیشە پاساو و عوزرت بۆ دەهێنێتەوە ، کەسی مونافیق و دووڕوش هەمیشە شوێن هەڵەو کەم و کوڕیەکانت دەکەوێت .

(الإحياء ٢/٩٧)

---

١٩١. پەلە_بکە_لەئەنجامدانی ...

خالدی کوڕی معدان ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێ : ئەگەر یەکێکتان دەرگایەکی خێری بەڕوودا کرایەوە ، با پەلە بکات و زوو کارە خێرەکە ئەنجام بدات ، چونکە نازانرێت کەی ئەو دەرگا خێرەی بەڕوودا دادەخرێت .

حلية الأولياء (٥/٢١٢)

---

١٩٢. «ئەی پاکو بێگەرد، ئەم ڕێگایە چەند تەنگە لەسەر ئەو کەسەی تۆ نیشاندەری نەبیت، ئەی پاکو بێگەرد، ئەم ڕێگایە چەندە ترسناکە لەسەر ئەو کەسەی تۆ دڵخۆشکەری نەبیت»

ئافرەتێک لە تابعین | عيون الأخبار (١/٢٤٥)

---

١٩٣. بكر العابد دەڵێت: « هەموو دڵ تەنگیەک کۆنەبێت ، جگە لە دڵ تەنگی تاوان»

الهم والحزن لابن أبي الدنيا (٢٨)

---

١٩٤. لە هیچ شتێک موعجیب مەبە بەخۆت...!

وەک وتراوە :

﴿ سەرسام بوون بە نەفس ی خۆت دەلیلە لەسەر لاوازی ژیریت ﴾.

جامع بيان العلم وفضله « ١/٥٦٩ »

---

١٩٥. فضيل بن عياض «رحمه الله» دەفەرموێت:

«بیرکەنەوە و کاربکەن پێش ئەوەی پەشیمان ببنەوە، وە هەڵمەخەڵەتێن بە دونیا ، چونکە بەڕاستی ساغەکەی نەخۆش ئەکەوێت ، وە شتە تازەو نوێکانی خراپ وشڕ ئەبێ ، وە خۆشی ونیعمەتەکانی لەناو ئەچێ ،وە گەنجەکەی پیرئەبێت ».

---

١٩٦. ترسی سەلەف لە دۆزەخ

مالک کوری دینار دەگێرتەوە دەفەرمووێت ئەگەر بتوانم شەو نەخەوم واللە ناخەوم ئەترسم عەزابی الله دابەزی و مالک خەوتبێ وە ئەگەر کۆمەلێک دۆست و یاریدەدەرم هەبوایە بلاوم دەکردنەوە لەسەر جادە و شارەکان هاوربکەن یا_أیها_الناس_النار_النار پێم دەوتن هاواربکەن بۆ هەموو خەلکی دونیا چۆن دەخەون کە جهنم چاوەرێتانە ...

اللهم أجرني من النار.......

قال مالك بن دينار: لو استطعت أن لا أنام لم أنم، مخافة أن ينزل العذاب وأنا نائم، ولو وجدت أعوانا لفرقتهم ينادون في سائر الدنيا كلها: يا أيها الناس النار النار

شعب_الإيمان_للبيهقي

---

١٩٧. عومەری کوڕی عبدالعزیز دەیفەرموو:

هەر کەسێک دینەکەی بەکار بێنێت بۆ مناقەشە، ئەوا زۆر دین و بیر و باوەڕی دەگۆڕێت، زوو لادەدا لە ڕێگا .!

الزهد ريوايه عبدالله ص (٣٦٦)

---

١٩٨. ئیمامی حسن (١١٠هـ) دەڵێ:

هەر کەس براکەی عەیبدار بکات بەهۆی تاوانێک کە تەوبەی لێ کردووە و پەشیمانە لێی، الله بەو تاوانە ئەمیش تاقی دەکاتەوە.

الزهد لأحمد (١٦١٠)

---

١٩٩. فضيل ـی کوڕی عیاض فەرموویەتی:

ئەوەی خراپەیەکی بینی لە براکەیدا و پێکەنی بە ڕوویدا ئەوە خیانەتی لێ کردووە.

المجالسة | (٥/١١٥).

پێویستە هەڵەکان بۆ یەکتر ڕاست بکەینەوە و ئەمر بە چاکە بکەین لەگەڵ یەکتر و نەهی لە خراپە بکەین، وە تۆش گەر هەڵە بووی پێویستە تەکەبور نەتگرێ و دان بە هەڵەکەت دابنێیت، وە مەمنونی براکەت یان خوشکەکەت بیت کە ڕاستت دەکاتەوە

---

٢٠٠. فضيل ـی کوڕی عیاض فەرموویەتی:

ئەوەی خراپەیەکی بینی لە براکەیدا و پێکەنی بە ڕوویدا ئەوە خیانەتی لێ کردووە.

المجالسة | (٥/١١٥)

---

٢٠١. فُضَيْلُ بْنُ عِيَاض (رحمه الله) دەربارەی وتەی الله تعالى ( وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ) دەڵێت:

لە نەفسی خۆتان غافل مەبن چونکە هەر کەسێک لە نەفسی خۆی غافل بێت ئەوە خۆی کوشتووە.

الجامع الأخلاق الراوي وأداب السامع للخطيب البغدادي ص (١٦)

---

٢٠٢. سەلمانی فارسی دەفەرمووێ:

هەر کەسێک لە دونیادا خۆی بە کەم بزانێت لەپێناو الله، الله تعالى بەرزی دەکاتەوە لە دواڕۆژدا.

قال سلمان الفارسي:

من تواضع لله في الدنيا، رفعه الله يوم القيامة.

الزهد لوكيع | (٢١٥)

٢٠٣. فوضەیلی کوڕی عیاض فەرموویەتی:

گریانی ڕۆژ تاوانە ئاشکراکان دەسڕێتەوە، وە گریانی شەو تاوانە نهێنییەکان دەسڕێتەوە.

جامع العلم والحكم (٤٥٨)

٢٠٤. جا کوا پیاو ماوە ..!

تابعی بەڕێز عبدالله کەڕی ذکوان -رحمه الله- دەڵێت : پیاو بە پیاو دانانرێت، هەتا سوننەت نەناسێت .

تأريخ للإمام البخارى

٢٠٥. سەلەف چۆن نەفسی خۆیان ئەشکاندەوە؟!

دەگێڕنەوە عبدالله کوڕی سەلام بە ناو بازاڕدا تێپەڕی و کۆڵێ داری بەسەر شانەوە بوو،لێیان پرسی: بۆچی ئەم کۆڵە دارەت هەڵگرتووە خۆ تۆ پێویستت پێ نییە و الله وەزعی باش کردویت؟

لە وەڵام دا ووتی: ویستم نەفسم بشکێنم و لە لووت بەرزیەکەی بیخەمە خوارەوە چونکە پێغەمبەر(صلى اللهُ عليه وسلَّم) فەرمویەتی:

ناچێتە بەهەشتەوە هەرکەسێك مسقاڵە زەڕەیەك ئەوەندەی تۆوی خەرتەلەیەك لووت بەرزی خۆ بەزل زانی لە دڵ دا هەبێت.

حياة الصحابة:(٢/٢١٤)

٢٠٦. مَالِكَ بْنَ دِينَارٍ دەڵێ :

دڵ ئەگەر بێتوو خەمبار نەبێت خراپ دەبێت وەک چۆن خانوو تێیدا نیشتەجێ نەبیت کاوڵ دەبێ

الهم والحزن لابن أبي الدنيا(٨)

٢٠٧. مالكى كوڕى دينار'رحمه الله' ئـــەفەرموێت:

❞ئەگەر ڕەقیەكت بینی لە دڵتدا، وە شەكەتی لەلاشەتدا، وە بێ بەش بوون لە رزق و رۆزیتدا، ئەوا بزانە قسەت لە شتێكا كردووە كە پەیوەندی بە تۆوە نەبووە.❝

فيض القدير ١/٣٦٩

٢٠٨. عمری كوڕی عبدالعزیز ڕەحمەتی خوای لێبێت بوو بەخەلیفەی موسڵمانان

خەڵكی لەدیوەخانی خیلافەتدا لەحزووریدا وەستابونـ! عمر زۆری پێ ناخۆش بوو لەدڵی خۆیدا بۆیە ڕووی تێكردنـ و ووتی:ئەگەر ئێوە بەپێوە دەبنـ ئەوە منیش باهەڵسمە سەرپێ! وەئەگەریش دادەنیشنـ ئێمەش لەگەڵتانـ دادەنیشینـ! ((چونكە خەڵكی تەنها لەحزووری پەروەردگاری جیهاندا بە پێوە دەوەستن ..))

||عمر بن عبدالعزيز للصلابي|ص١٥٠ ..

٢٠٩. قال عمر بن الخطاب -رضي الله عنه

{ من قال انا عالم فهو جاهل }

هەركەسێ بڵێت عالمم ئەوە بزانە جاهیلە

'الإبانة الكبرىٰ | ١٢٦٧

٢١٠. كعب الأحبار دەڵێ: سەردەمێک بەسەر خەڵكیدا دێت ڕقیان لە ئامۆژگاری دەبێت تا وای لێ دێت ئیماندار ئیمانەكەی خۆی دەشارێتەوە وەک چۆن خراپەكار خراپەی خۆی دەشارێتەوە.

المجالسة وجواهر العلم (١١٨٦)

٢١١. رَجَاءَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ دەڵێ :پرسیارم لە مجاهد كرد ئەی باوكی حەجاج ئایە غەیبەت دەست نوێژ دەشكێنێت ئیمام وتی : بەڵێ دەست نوێژ دەشكێنێت وە رۆژووش دەشكێنێت ))...

الزهد لابن أبي عاصم (١٢٠)

---

٢١٢. ئیمامی علی رضی الله عنه دەفەرموێت :

وای لێدێ هیچ شتێ لە ئیسلامەتی نامێنێت تەنها ناوی نەبێت ، وە لە قورئانیش تەنها وێنەكەی

مزگەوتەكانتان ئەو ڕۆژانە باڵەخانەی زۆر بەرز و جوانن بەڵام دارماوە لە هیدایەت و هیچی تێدا نییە

زاناكانتان خراپترینی سەرزەوین وە فیتنە لەوانەوە دەردەچێت و دێتەوە .

[ ابطال الحيل لإبن بطة العكبرى ]

---

٢١٣. ربیع كوڕی خُثیم چاوەكانی دادەخست كاتێ ئافرەتێ بەپێشی داهاتبوایە وا خۆی بێدەنگ دەكرد ئافرەتەكە وای دەزانی كوێرە ، تا ئافرەتەكە دەیووت خوایە پەنات پێ دەگرم لە كوێری

[ذم الكلام : ٩١]

---

٢١٤. پێشەوا أحمد ـی كوڕی إبراهیم (٢٤٦ه) دەفەرمووێت:

یونس لەكاتی مردنیدا سەیری پێەكانی كردو گریا ،پێیان وت: ئەی باوكی عبدالله بۆچی دەگری؟

فەرمووی: «پێەكانم تۆزاوی نەبوون لە پێناو پەروەردگار عز وجل» مەبەستی لە جیهاد دا.

حلية الأولياء لأبي نعيم (٣/١٩)

---

٢١٥. ئیمامی أبو بكری صدیق " رضي الله عنه " فەرموویەتی : " ئەی خەڵكینە من شوێنكەوتەی قورئان و سوننەتم ، وە من كەسێكی موبتەدیع نیم و شت دابهێنم لە دیندا ، كەواتە لەسەر ئەو كارە چاكانەی كە ئەیكەم هاوكارم بن ، ئەگەریش بینیتان لامدا ڕاستم بكەنەوە " .

ئیمامی مالك " رحمە الله " ڕیوایەتی كردووە لە : الموطأ ١/١٦١

---

٢١٦. ابن وهب دەڵێ: بیستم لە الإمام مالك فەرمووی: زەلیلی و ئیهانە كرد بە زانست، ئەوەیە كاتێ پیاو قسەی كرد بە علم، لەگەڵ یەكێكی بكا كە(دەزانێ) گوێرایەڵی ناكا.

[ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٥١ ]

ابن وهب دەڵێ: بیستم لە مالك فەرمووی: بێگومان ئەوكەسەی داوای علم دەكا دەبێ نەرموونیان و ئارامگر و بە خەشیە بێ، وە دەبێ شوێنكەوتەی آثاری پێش خۆی بێ(لە سەلەف).

[ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٥٢]

---

٢١٧. ئەگەر ابن عباس (الله لێی ڕازی بێت) بە ڕێگایەك بڕۆشتبایە خەڵك دەیان گووت: مسك تێپەڕی بەم ناوە یان ابن عباس ؟

لەبەر بۆن خۆشی.

سیرە أعلام النبلاء | (٣٣٧)

---

٢١٨. حاتم الأصم دەڵێ:

لە فەقیری مەترسن !

چونكە الله تۆی ترساندووە بە ئاگر، تۆی نەترساندووە بە فەقیری.

الفوائد والأخبار لإبن حمكان ص (١٥٢)

---

٢١٩. ئیمامی ئاجوری (رحمه الله) دەڵێت:

هەر کەس پێی خۆشە بگاتە پلە و پایەی غەریبەکان ( الغرباء ) با ئارام بگرێت لەسەر نارەحەتکردن و خراپێتی دایک و باوکی و خێزانەکەی و براکانی و نزیکەکانی.

الغرباء: ئەوانەن کە لەسەر تەوحید و مەنهەجی ئیسلامی ڕاستەقینەن لەکاتێکدا زۆرینەی خەڵک لە ناو گێژاوی گومڕاییەکان دان.

من أحب أن يبلغ مراتب الغرباء فليصبر على جفاء أبويه وزوجته وإخوانه وقرابته.

الغرباء ص (٣٨)

---

٢٢٠. سەلەف دەڵێن:

حاڵی ئافرەتی ئیماندار لە بەهەشت چاکترە لە حاڵی حۆریەکان، وە دەرجەی جوانی ئافرەتی ئیماندار بەرزتر و جوانترە لە حۆریەکان.

تفسير القرطبي الأشعري ( ١٦ / ١٥٤ )

---

٢٢١. عکرمة دەڵێ:

پیاوێک لە ئەهلی بەهەشت کاتێ پۆشاک لەبەر دەکات لە سەعاتێکدا (٧٠) جار ڕەنگی پۆشاکەکەی دەگۆڕێت.

صفة الجنة لابن أبي الدنيا برقم (١٥١)

---

٢٢٢. وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ دەڵێ:

پیاوێک لە عوببادەکان بە کوڕەکەی گووت: ئەی کوڕەکەم مەبە لەو کەسانەی ئومێدی قیامەت یان هەیە بەبێ کردەوە، وە تەوبە دواخەی بە درێژی ئەمەل و ئاواتی ژیان.

التوبة لابن أبي الدنيا (٢٨)

---

٢٢٣. أيوب السختياني ( ١٣١هـ ) دەڵێ:

أبو قلابة پێی گووتم: ئەی أيوب، چوار شت لە منەوە لەبەر بکە:

١- لە قورئان ـدا قسە مەکە بە ڕەئی خۆت.

٢- وە ئاگاداری قەدەر بە.

٣- وە ئەگەر باسێکی هاوەڵانی رسول الله ﷺ کرا دەستی پێوە بگرە.

٤- وە گوێت شل مەکە بۆ ئەهلی ئەهواء کە قسەت بۆ بکەن، ئەوەی خۆیان بیانەوێ فڕێی دەدەنە ناو دڵتەوە.

الإبانة الصغرى

---

٢٢٤. أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيِّ دەڵێ:

الله تعالى هەرگیز حەیای بەندەی خۆی نابات و فەزحی ناکات لەسەر تاوانەکانی و سەتری دەکات تا دەنکێک لە خێری تێدا بێت.

التوبة لابن أبي الدنيا (٧٩)

---

٢٢٥. وكيع دەڵێت ژنێکی عابد هەبوو خەڵکی یەمەن بوو، کاتێک ئێوارە دەهات دەیگووت ئەی نەفس ئەمشەو شەوی تۆیە هیچ شەوێکی ترت نییە جگە لەم شەو، جا تێبکۆشە و (عیبادەتی زۆری تێدا بکە)، وە کاتێکیش بەیانی بەسەردا دەهات دەیگووت ئەی نەفس ئەمرۆ ڕۆژی تۆیە هیچ ڕۆژێکی ترت نییە جگە لەمڕۆ، جا تێبکۆشە و (عیبادەتی زۆری تێدا بکە).

كتاب الزهد لوكيع (٩)

---

٢٢٦. مكحول دەڵێ:

پیاو خێری نەکردووە بە باشترین خێر چاکتر لە زانستێک کە بڵاوی دەکاتەوە.

شرح مذاهب أهل السنة (٥٩)

٢٢٧. ئیمامی عمر دەفەرموویت:

بەشی خۆتان دەست بخەن لە جیابوونەوە.

اسحاق دەفەرموویت:

پرسیارم کرد لە ابن راهویە دەربارەی ئەو وتەی ئیمام عمر مانای چییە ؟

ئەویش فەرمووی: کات بە دەست بهێنن بۆ عیبادەت، چونکە تەنهایی هۆکارە بۆ کات دان بە عیبادەت.

أحمد بن حنبل، الجامع لعلوم الإمام أحمد - شرح الأحاديث والآثار، صفحة (٣٨٥)

---

٢٢٨. گووترا بە عبدالله ـی کوڕی المبارك:

ڕەوشت جوانیمان بۆ کۆ بکەوە لە ڕستەیەک،

ئیمام گووتی: واز لە توڕەبوون بێنە.

جامع العلوم والحكم لإبن رجب ص (٣٦٣)

---

٢٢٩. مجاهد دەڵێ:

کاتێک کەسێک دەمرێت و ملك الموت ڕۆحی دەکێشێت، ئەو مردووە هیچ شتێک نییە نەیبینێت کاتێک دەیشۆن، وە کاتێک کفن ـی دەکەن، وە کاتێک دەیخەنە گۆڕەوە.

المنامات لابن أبي الدنيا (٩)

---

٢٣٠. مەسروق دەڵێ:

بەسە زانست بۆ کەسێک لە الله بترسێت، بەسە نەزانی بۆ کەسێک بە زانستەکەی خۆی سەرسام بێت.

٢٣١. ئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرمووێت:

ئێوە کاری وا دەکەن لە تاڵە موویەک بچوکترە لە چاوتاندا، کەچی ئێمە لە سەردەمی رسول اللّٰه ﷺ دا بە یەکێک لەو تاوانانەمان داناوە کە مرۆڤ بە هیلاک دەبات.

البخاري (٦٤٩٢)

٢٣٢. عومەری کوڕی عبدالعزیز دەفەرمووێت:

نەگبەتی بۆ کەسێک کە ورگی بووە بە گەورەترین خەمی.

موسوعة إبن أبي الدنيا (٤/ ١١٧)

٢٣٣. عبدالكريم بن مالک دەڵێ:

گەیشتین بە کەڵە پیاوانی سەلەف، عیبادەتیان لە ڕۆژوو و نوێژ نەدەبینی بەڵکو عیبادەتیان لە دەست هەڵگرتن لە باس و عەیب و عار و ناموسی خەڵک دەبینی.

الصمت لابن أبي الدنيا (١٩٢)

٢٣٤. عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) دەڵێ:

خۆتان مەشغول مەکەن بە باسی خەڵکەوە چونکە بەڵایە، بەڵکو خۆتان مەشغوڵ بکەن بە یادی الله چونکە ڕەحمەتە بۆتان.

الصمت لابن أبي الدنيا (١٩٥)

٢٣٥. وازهێنان له خوێندنی قورئان یەکێکه له تاوانه گەورەکان ..

أبو العالية دەفەرمووێت: ئێمه وا هەژمارمان دەکرد له هەره تاوانه گەورەکانه پیاوێک فێری قورئان دەبێت و پاشان دەخەوێت و هیچی لێ ناخوێنێت.

" كُنَّا نعُدُّ مِن أعظم الذنب أن يتعلّم الرّجل القرآن ثمّ ينام لا يقرأ منه شيئًا ".

الزهد للإمام أحمد (٣٠٣)

---

٢٣٦. يزيد بن كعب دەڵێ:

بترسن له قسه هێنان و بردن چونکه بەڕاستی خاوەنەکەی له عەزابی گۆڕ ئیسراحات ناکات.

الصمت لابن أبي الدنيا (٢٧٣)

---

٢٣٧. سعيد بن جبير دەڵێ:

جێبەجێ کردنی حوکمێکی الله تعالى لەسەر موسڵمانان چاکتره له چل ڕۆژ باران بارین.

كتاب الأموال لابن زنجويه (١٦)

---

٢٣٨. عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) دەڵێ:

ڕزگارکردنی پیاوێک له موسڵمانان له دەست و زیندانی موشریکان لام خۆشەویستره له جزیرەی عەرەب.

كتاب الأموال لابن زنجويه (٥١٥)

---

٢٣٩. قال الإمام الفضيل بن عياض:

باشترین کردەوه شاراوەترینیانه.

له هەموویان پارێزراوتره له شەیطان، دوورترینه له - ڕیا - ڕووپامایی.

٢٤٠. لە گەورەترین هەڵوەشێنەرەوەکانی تەوحید

ئەوەیە کە دۆستایەتی بکەیت لەگەڵ موشریک وە بە دەستەکانت سەریان بخەیت یاخوود بە زمانت یاخوود بە ماڵ و سامانەکەت!

|| عبدالرحمن ـی کوڕی حەسەن || ڕەحمەتی اللە،ـی لێبێت

الدرر السنية | ١١/٣٠٠

---

٢٤١. ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکیدا دێت دینیان پارەیە قیبلەیان ئـافرەتە

علي بن ابي طالب (رضي الله عنه)

---

٢٤٢. بە خوشکە عوبەیدەی کچی کیلابم وت:

حەزت لەچییە؟!

فەرمووی؛ حەزدەکەم بمرمـ!

وتمـ: بۆچی؟

فەرمووی؛ چونکە سوێند بەخوا هەموو شەوێک کە ڕۆژ دەبێتەوە لەوە دەترسم ئەو ڕۆژە گوناهێک بکەم و بەهۆیەوە خۆشی و شادی ژیانی قیامەتم لە دەست دەربچێت.

|| سەلەمەی کوڕی ئەفقەمـ || ڕەحمەتی اللە،ـی لێبێت

صفة الصفوة | ٢/٢٩

---

٢٤٣. عبداللە ـی کوڕی عەون پێکای کە فەرموی ؛

ڕەحمەتی اللە لەوەی دەست دەگرێت بە ئەثەرەوە و پێی ڕازی ئەبێت ئەگەرچی دەستگرتنی بەئەثەرەوە ڕەزا گران و قورسی بکات و دوای بخات لای خەڵک!

٢٤٤. ئیمام سعيد بن جبير (رحمه الله) فەرموویەتی:

"رجل اجترح من الذنوب، فكلما ذكر ذنوبه احتقر عمله".

پیاوێک گوناهی زۆری ئەنجامدا، هەر کات گوناهەکانی بیردەکەوێتەوە کردەوە چاکەکانی سوك دێتە بەرچاو.

حلية الأولياء ٢٧٩/٤

٢٤٥. سەهوی کرد ئەوەی وایزانی عالمە

❞ مرۆڤ زانایە هەتاکو عیلم داوا ئەکات ، هەر کات وا گومانی برد کە زانایە ، ئەوکات جاهیلە! ❝

|| ئیبن و موبارەک || ڕەحمەتی الله،ی لێبێت

المجالسة و جواهر العلم | ٢/١٨٦

٢٤٦. أبو تراب النخشبي - رحمه الله - دەڵێت:

« ئەی خەڵکینە.. ئێوە سێ شتان خۆشدەوێت وە هی ئێوە نیە:

گیانتان خۆشدەوێت و هی اللهیە، وە ڕۆحتان خۆشدەوێت و ڕۆح هی اللهیە، و ماڵ و پارەتان خۆشدەوێت و ماڵ و پارە بۆ میرات گرەکانە، وە داوای دوو شتان دەکەن: خۆشی و ڕاحەت، وە هەردووکیان لە بەهەشتە ».

حلية الأولياء لابي نعيم ١/٤٦

٢٤٧. |لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلا الْهُمُومُ وَالأَحْزَانُ...|

موسی ـی کوڕی داود ئەفەرموێ:

بەیانییەک زوو گەشتم بە خواناسێک تەمەنی لە دەوری ٣٠ساڵێک ئەبوو , پێم ووت:

باشە من هەرگیز تۆم نەدیوە ڕۆژێ لە ڕۆژان..! , ئەویش ووتی:

بەڵێ ڕاست ئەکەی براکەم , ئەمە سەردەمی یەکتر بینین و کۆبونەوە نییە , هیچ شتێ نەماوە لە دنیا بە غیری خەم و خەفەت .. دواتر جێی هێشتم.

|العُزلَة والانْفرادْ |

---

٢٤٨. عن شبيل بن عوف الأحمسي قال :

كان يقال : «من سمع بفاحشة فأفشاها،كان فيها كالذي بدأها»

دەوترا ؛ « هەرکەسێک کارێکی خراپە و فاحیشە ببیستێت و بڵاوی بکاتەوە، سزای وەک ئەو کەسە وایە کە سەرەتا دەستی پێکردووە».

[ الزهد لوكيع : ٤٥٠]

---

٢٤٩. ئەبو عبداللە الخطیب دەڵێت:

ئەبو حەمدون دەفتەرێکی هەبوو.

ناوی (٣٠٠)کەس لەهاوڕێکانی تیا نوسیبو

همو شەوێ یەک یەک بەناو بردن دوعای بو دەکردن

صفـة الصفوة [١ / ٢٣٩]

---

٢٥٠. ئەبو بەکری ڕازی' [ زانا مەزنەکەی ئیسلام ] دەڵێ؛

لە " ئیبراهمی کوڕی شەیبانم " بیست کە دەیفەرموو؛ }

{هەر کاتێک ترسی #خــوا لەدڵدا ڕیشکی داکوتا }،،،

شوێنی ئارەزوو پەرستی دەسوتێــنێ دنیا پەرستی دەفڕێنــێ زمانیش لاڵ دەکا لە باسکردنی شتی دنــیایــی،،،،

الجامع لشعب الايمان ٥.٩ ٢,٠/٠,

---

٢٥١. قال الإمام أبو بكر بن أبي شيبة في «المصنف» :-

حدثنا ابن مهدي عن سفيان عن الأعمش عن طلحة بن عميرة عن مسروق قال : ود أهل البلاء يوم القيامة أن لحومهم كانت في الدنيا تقرض بالمقاريض.

تابعي مسروق دەڵێت :- خاوەن بەڵاکان لە ڕۆژی قیامەتدا خۆزگە دەخوازن کەوا لەدونیا بە گازگر گۆشتیان گاز گاز لێ بکرابایەوە

( کاتێ دەبینن پاداشتیان چەند گەورەیە )

---

٢٥٢. محمد بن واسع - رحمه الله - دەڵێت :-

گەشتووم بە پیاوانێک ، کە پیاوی وای تێدابوو سەری خۆی و سەری خێزانەکەی لەسەر یەک سەریندا بووە بەهۆی گریانی تا ژێر سەرینەکەی تەڕ دەبوو بەبێ ئەوەی خێزانەکەی هەستی پێ بکات ، سوێند بەخوا گەشتووم بە پیاوانێک کە پیاوی وای تێدابوو لە ڕیزی نوێژدا فرمێسکەکانی بەسەر ڕومەتەکانیدا ئەهاتە خوارەوە بێ ئەوەی ئەو کەسەی لە تەنیشیدا بوو پێی بزانێت .

[ موسوعة ابن أبي الدنيا - كتاب الإخلاص ] .

ئا گاداری ڕیابن کردە وە کانتان پوچە ڵ نە کاتە وە

---

٢٥٣. سەعدی کوڕی جوبەیر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو: شەوانی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان چراکانتان مەکوژێننەوە. [مەبەستی لەوەیە: عیبادەتی تێدا بکەن و شەوەکانی بە شەونوێژ و قورئان خوێندن و زیکری خوا بەسەربەرن].

لطائف المعارف (٢٦٣)

---

٢٥٤. یەحیای کوڕی موعاذ ڕەحمەتی خوای لێبێ فەرموویەتی:

نەخۆشی لاشە بە ئازاریەوەیە، وە نەخۆشی دڵ بە تاوانەوەیە. لاشە تام چێژی خواردن ناچەژێ لەکاتی نەخۆشیی دا. هەروەها دڵیش تام و چێژی عیبادەتی پەروەردگاری ناچەژێ لەگەڵ بوونی تاواندا.

[ ذَمُّ الهوى (٦٨/١) ]

---

٢٥٥. هەندێ لەپیاوچاکان فەرمویانە:

ئەگەر ناخۆشییەکانی دونیا نەبا،ئەوا لەقیامەت موفلس و بێ چاکە دەبوین

زاد المعاد لإبن القيم٤ / ١٧٦

---

٢٥٦. حافظی ابن کثیر ڕەحمەتی خودای لێبێت ـ دەفەرموێ ـ :

"مَنْ أَسَاءَ إِلَيْكَ فَادْفَعْهُ عَنْكَ بِالْإِحْسَانِ إِلَيْهِ."

" هەرکەسێك خراپەی لەگەڵ کردی تۆ بەچاکەکردن وڵامی بدەوە ."

تفسير القرآن العظيم (٧/١٨١)

---

٢٥٧. ئیمامی الأوزاعي ـ رحمه اللّٰه ـ دەفەرموێت :

« سەردەمێك بەسەر خەڵكی دا دێت كەمترین شت لەو سەردەمەدا ئەوە دەبێت ، كەسێك دڵدانەوت بكات، دیناڕێكی حەڵاڵ بێت ، یان كارێك بێت لەسەرسوننەت بێت ».

الزهد للإمام أحمد ؛ ٩٦٤

---

٢٥٨. ❞ بە ئاستی خەمباریت بۆ دونیا ،خەمی قیامەتت لەدڵت دەڕوات ، بە ئاستی خەمباریت بۆ ئاخیرەتت خەمی دونیا لە دڵت دەڕوات. ❝

مالیكی كوڕی دینار'رحمه الله'

الزهد لابن ابی الدنیا

---

پێشەوا بشر كوڕی حارث ڕەحمەتی خوای لێبیت دەفەرمووێت:

" كار مەكە بۆ ئەوەی باسی بكرێ ، كاری چاكت بشارەوە هەروەكو چۆن كاری خراپت دەشاریەوە ".

السیر للذهبي(١٠/٤٧٦)

---

٢٥٩. ئەگەر تەواوی خەڵكی بەگومان بن لە حەق ئەوە من گومانم لێی نابێ ئەگەر چی بەتەنهاش بم !

|| ئەبو سلێمانی دارانی || ڕەحمەتی اللە،ی لێبێت

حلیة الأولیاء لأبي نعیم | ٩/٢٥٦

---

٢٦٠. عومەر ی كوڕی خەطاب ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت :

لێپرسینەوە لەنەفسی خۆتان بكەن پێش ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵ بكرێت .

[ مصنف ابن أبي شیبة (٣٤٤٥٩)]

---

٢٦١. شاری بەغدا لە دیدی زانایان...

• یونسی کوڕی عەبدولئەعلای سەدەفی دەڵێت:

شافیعی پێیگوتم: ئایە بەغدات بینیووە؟ گوتم نەخێر!

گوتی دونیات نەبینیووە ئەی یونس!!

• شافیعی دەفەرموێت: هەرکاتێك چوبمە مەملەکەتێکەوە ئەوا توشی چەندان سەفەری دیکە بوومە

(یانی ماندوویەتیەکی زۆری ویستووە) بەڵام کاتێك چوومە ناو شاری بەغداوە وەکو ئەوە وابوو چوبێتمە ناو چەند مەملەکەتێکەوە

• هەندێک گوتوویانە:

دونیا چۆڵەوانیە،شارستانیەتەکەی شاری بەغدایە

• ئیبن عولیە دەڵێت:

هیچ کەسێکی ژیر و ئاقڵم نەدیووە لە داواکەرانی فەرمووده - طلب الحديث - وەکو خەڵکی بەغدا وە هیچ کەسێکم نەدیووە وەکو ئەوان هیمەتیان بەرز بێت بۆ داواکردنی زانست

• ئیبن موجاهید دەڵێت: لە خەونمدا

- ئەبو عەمرو بن عەلام - بینی، پێمگووت:

خوای گەورە - جل جلاله - چی لەگەڵ کردی؟

ئەویش گوتی:واز لەو پرسیارەی بینە!

ئەوەی لە بەغدایێ بووبیت و لەسەر بیروباوەڕی

ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش مردبێت، لە بەهەشتی دونیاوە دەچێتە بەهەشتەکەی پەروەردگار

• هەندێکیش گووتوویانە:

لە جوانیەکانی خەلافەتی - ئیسلامی - :

ڕۆژی هەینیە لە شاری بەغدا، نوێژی تەراویحە لە شاری - مەککە -، وە ڕۆژی جەژنیشە لە شاری- طەرسوس -

البداية والنهاية ٤٠١/١٣

---

٢٦٢. علی کوڕی ابی طالب رضی الله عنه دەفەرمووێت:

نزیکە زەمانێک بێت بەسەر خەڵکی دا لە ئیسلامەتی هیچ نەمێنێ تەنها ناوەکەی ، وە لە قورئان هیچ نەمێنێ تەنها وێنەکەی ، مزگەوتەکانیان ئاوەدانە (جەماعەتی تێدا دەکرێت) بەڵام وێرانەو دورە لە هیدایەت ( کەس لە مزگەوت فێری توحید و ئیمان نابێت )، زاناکانیان (مەلاکانیان) خراپترین کەسن لەژێر ئاسمان لەوانەوە فیتنە دەردەچێت(کوفر و شیرک) بۆ ئەوانیش دەگەڕێتەوە .

يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لا يَبْقَى مِنَ الإِسْلامِ إِلا اسْمُهُ ، وَلا يَبْقَى مِنَ الْقُرْآنِ إِلا رَسْمُهُ ، مَسَاجِدُهُمْ يَوْمَئِذٍ عَامِرَةٌ ، وَهِيَ خَرَابٌ مِنَ الْهُدَى ، عُلَمَاؤُهُمْ شَرُّ مَنْ تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ ، مِنْ عِنْدِهِمْ تَخْرُجُ الْفِتْنَةُ ، وَفِيهِمْ تَعُودُ .

#رواه_البيهقي_في_شعب_الإيمان

---

٢٦٣. عومەری کوڕی عبدالعزیز دەفەرمووێت:

ئەگەر لە دونیادا شتێك خەمباری کردی ئەوا یادی مردن بکەرەوە لەسەرت ئاسان دەبێت .

الفرج بعد الشدة لابن أبي الدنيا (ص٤٢)

---

٢٦٤. محمد بن كعب - رحمه الله تعالى - فەرموویەتی:

خوای گەورە ویستی خێری بۆ هەر کەس بوێت :

١. دونیا نەویستی دەکات.

٢.وە لە دین تێی دەگەیەنێت.

٣.وە عەیبەکانی خۆی پیشان دەدات.

---

٢٦٥. سفيان بن عيينة رحمـه الله دەفەرمووێت:

ئیماندار پێویستی بە ئارام گرتن هەیە، هەروەك چۆن پێویستی بە خواردن و خواردنەوە هەیە.

---

٢٦٦. إياس کوڕی معاويه دەفەرمووێت:

هەر پیاوێک عەیبەکەی{کەم و کورتیەکەی}خۆی نەزانێت ئەوە ئەحمەقە

پێی وترا: ئەی عەیبی تۆچیە؟

فەرمووی: زۆر قسەکردن!

#البدایه_١٠_١٨٩

---

٢٦٧. يحيى بن يحيى الليثي -رحمه اللّٰه دەڵێت-:

هەرکەس مردن هات بەپیریەوە وە ئەم خەریکی گەڕان بوو بەدوایی زانست ئەوا لەنێوان ئەم و پێغەمبەراندا تەنها یەک پلە نێوانیانە لەبەهەشتدا.

ترتيب المدارك (٣/٣٩١)

---

٢٦٨. له مه‌جلیسێکی عمران بن حصن حه‌دیثێك باسکرا پیاوێکیش ووتی ئه‌گه‌ر ئایه‌تێکی قورئانتان بخوێندایه‌ته‌وه له‌م حه‌دیثه‌تان باشتر بوو ، عمرانیش ووتی تۆ گێلی ئایه چۆنیه‌تی نوێژ ڕوونکراوه‌ته‌وه له قورئاندا ؟ ئایه چۆنیه‌تی زه‌کات ڕوون کراوه‌ته‌وه له قورئاندا ؟ قورئان سابتی ده‌کات سوننه‌ت ڕوونی ده‌کاته‌وه. (الإبانة الصغرى ٧٢)

---

٢٦٩. علي بن أبي طالب رضي الله عنه ده‌فه‌رموێت: ڕۆژگارێک دێت به‌سه‌ر خه‌ڵکیدا ئیماندار تێیدا ، زه‌لیل تره له کۆیله‌یه‌کی ئافره‌ت.

سنن سعيد بن منصور (٦٣٤٩)

---

٢٧٠. ابن عمر ده‌فه‌رموێت: هه‌رکه‌سێک پۆشاکی ناوداری و شوهره‌ت له‌به‌ربکات، الله پۆشاکی زه‌لیلی له‌به‌ر ده‌کات ،پاشان ده‌یخاته ئاگر.

سنن سعيد بن منصور (٦٠١٦)

---

٢٧١. أبو الدرداء رضي الله عنه ده‌ی فه‌رموو :

ئه‌وه‌چیه ده‌بینم زاناکانتان ڕۆشتون؟

نه‌زانه‌کانتان خۆیان فێرناکه‌ن و تێناکۆشن ؟

فێرببن! زانا و فێرخواز له پاداشتدا یه‌کسانن.

[«السير»(٢ / ٢٤٧)]

---

٢٧٢. حسن البصري رحمه الله ده‌فه‌رموێت:

"هیچ که‌س نیه ، پاره گه‌وره و عه‌زیز ته‌ماشاکات ئیلا الله زه‌لیلی ده‌کات عز وجل".

الزهد للإمام أحمد رحمه الله.

---

٢٧٣. سوفیانی کوڕی عیینة (١٩٨هـ) دەڵێ:

لە محمدی کوڕی منکدریان پرسی: کام کردەوەت لە هەموو کردەویەکی تر پێ خۆشترە؟ فەرمووی: خۆش کردنی دڵی براکان.

صفة الصفوة

---

٢٧٤. الإمام سفیان بن عیینة (١٩٧ هـ) ئەفەرموویت :

" لە خێردارترینی خێرەکان شاردنەوەی ئەو ناخۆشیانەیە کە بەسەرت دێن ".

حلية الأولياء (٧/٢٨٥)

---

٢٧٥. إمام_البخاري_فەرموویەتی :

ئارام بگرن ئەی هاوەڵانی سوننەت ڕەحمەتی ﷲ ﷻ تان لێبێت ئێو کەمترینی خەڵکیین .

#الجامع_لأخلاق_الراوي_١_١١٢

---

٢٧٦. أبو سليمان عبد الرحمن بن عطية الداراني، أحد علماء أهل السنة والجماعة ومن أعلام التصوف السني في القرن الثالث الهجري (١٤٠ - ٢١٥ هـ)

سئل الإمام الداراني رحمه الله:

"ما أعظم عمل يتقرّب به العبد إلى الله ؟ ".

فبكى أبو سليمان ثم قال: مثلي يسأل عن هذا ؟

قال: "أن ينظر الله إلى قلبك فيرى أنك لا تريد من الدنيا والآخرة إلا هو".

حلية الأولياء (ج٩/ص٢٧٤-٢٧٥)

پرسیان لە ئیمامی الدارانی رحمە اللە :

گەورە ترین کار چیە کە بەندە پێی نزیك بێتەوە لە الله ؟

جا گریا ابو سلیمان دواتر فەرمووی : کەسی وەك من پسیاری وای لێ دەکرێت ؟

فەرمووی : الله سەیری نێو دڵت بکات جا ببینێت هیچت لە دونیا و قیامەت دا ناوێت جگە لە و .

ئیلاهی دڵێکی ئاوامان پێ ببەخشیت

{ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ }

---

٢٧٧. بقية بن الوليد -رحمه الله- ئەڵێ: الأوزاعي رحمه الله پێی وتم : ئەی بقية عیلم ئەوەیە کە لە هاوەڵانی -محمد صلى الله عليه وسلم- هاتوە، ئەوەی لەوانەوە نەهاتبوو عیلم نیە.

[تاريخ الدمشق{٣٥/٢٠١}]

---

٢٧٨. ئیمامی ئاجوری رحمه الله دەڵێت :

هەر کەس پێی خۆشە بگاتە پلە و پایەی غریبەکان ( الغرباء ) با ئارام بگرێت لەسەر نارەحەتکردن و خراپێتی دایک و باوکی و خێزانەکەی و براکانی و نزیکەکانی .

الغرباء : ئەوانەن کە لەسەر تەوحید و مەنهەجی ئیسلامی ڕاستین لە کاتێکدا زۆرینەی خەڵک لە ناو گێژاوی گومڕاییەکان دان .

من أحب أن يبلغ مراتب الغرباء

فليصبر على جفاء أبويه وزوجته وإخوانه وقرابته .

الغرباء ص ٣٨

---

٢٧٩. دونيا لاى خوا يەك {{باڵە}} مێش ناهێنێ

دنيا لاى خودا زۆر بێ نرخە لەكاتێكدا خاوەنى هەموويەتى،

ئەى چۆن لاى تۆ نرخى دەبێت لەكاتێكدا خاوەنى نيت؟!

"يەحياى كوڕى مەعاذ"

---

٢٨٠. سوفيان بن ثوري رحمه الله ئەفەرمووێت:

كەسێكم نەديت كە لە تاوانێكم خۆش بێت و پێ خليسكانێكم داپۆشێ ، جا بينيم سەلامەتى لەوەدايە كە لە خەڵكى هەڵبێى.

محمد محى الدين عمر

---

٢٨١. ئيمامى البربهاري فەرموويەتى:

ئاگادارى سەردەمى خۆت بە، بە تايبەت بزانە لەگەڵ كێ دادەنيشيت و گوێ لە كێ دەگرى و هاوڕێيەتى كێ دەكەيت، پێ دەچێت خەڵكى كەوتبێتە ناو ڕيددەوە تەنها ئەوە نەبێت كە الله پاراستوويەتى.

وە كافر بوونە لە زۆر لاوە و زۆريشيان ئاگايان لە خۆ نييە.

شرح السنة ص (١١٦).

إبن عباس فەرموويەتى: لەگەڵ ئەهلى هەوا و ئارەزوو دامەنيشە، بەڕاستى دانيشتنەكانيان نەخۆشكەرى دڵە.

الإبانة الكبرى لابن بطة (٢ /٤٣٨)

---

٢٨٢. أبـي عمران دەڵێت:

الله سەیری هیچ شتێکـ ناکات ئیللا ڕەحمی پێ دەکات.

أبي عمران سوێندی خوارد گووتی: سوێند بە الله ئەگەر الله تعالی سەیری دۆزەخیەکانی بکردبا ئیللا ڕەحمی پێ دەکردن بەڵام بڕیاری داوە کە هەرگیز سەیریان نەکات.

کتاب السنة لعبدالله برقم الأثر (١٠٣٤)

---

٢٨٣. "ابن القیم" دەڵـێـت :

هەمیشە خەفەت لە قـورئـاندا :

1- یان نـەهـی لێکراوە ، وەک :

(( وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا )) سورة آل عمران : (١٣٩)

2- یانیش نـەفـی لێکراوە ، وەک :

(( فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ )) سورة البقرة : (٣٨)

نـهێـنـی ئەمەش ، هیـچ بەرژوەندییەکی مـرۆڤ لە خەم خواردندا نـییـە و خۆشەویستترین شـت لای شـەیطان خـەمی مـرۆڤەکانە ، تـا پەلبەستیان بکات لە بەجێهێنانی ئـەرک و پـەرستشەکانیان ،

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەمیشە پـەنـای بە خوا گرتووە

لە خـەم و خەفەت و دڵـتەنگی ئەیفـەرموو :((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ))

.

صحيح البخاري : (٢٨٩٣)

1- دڵـخـۆش بـە

2- گەشـبیـن بـە

3- گومانی باشت به خودا هەبێت ومتمانه و پشت و پەناتان خودا بێت ئەو کات خۆشی به تەواوی ماناکانیەوه بەرجەسته دەکەن و ڕازیبوون به هەموو حاڵێک بەدەست دەهێنن .

---

٢٨٤. یەکەم بەرەکەتی علم سوود وەرگرتنه !

| إبن حبـــان | رحمه الله

روضــة العقـلاء | ٦

---

٢٨٥. تابعی بەڕێز ئیمام مجاهد - رحمه الله - دەڵێت:-

لا أدري أي النعمتين أفضل، أن هداني للإسلام أو عافاني من الأهواء.

نازانم کام لەم دوو بەخششه چاکتر و گەورەتره، لەوەی که خودای گەوره ڕێنموییی کردوم بۆ ئیسلام، یاخود پاراستومی له هەواو ئارەزوو.

[ حلية الأولياء ٣/ ٢٩٣ ]

---

٢٨٦. ئـەڵێ پێشـەوا عومەر پێی ووتم :

ئایا دەزانی چ شتێک ئیسلام ئەڕوخێنێت ؟ دەڵێ ووتم نەخێر، ووتی : پێ خلیسکان و لادانی زانـاو ، مناقەشەی دوو ڕوو به قورئـان و، بڕیاری پێشـەوا گومڕاکەرەکان ئەیڕوخێنێت ..

||زیادی کوڕے حودەیر ..

||سنن الدارمي"١/٢٢٠

---

٢٨٧. وهبی کوری مینبه رەحمەتی خوای لێ بێت :دەفەرمووێت

هەرکەسێ هەوا و ئارەزووی بخاته ژێر پێیەکانی ئەوا شەیتان له سێبەرەکەشی دەترسێ .

الحلية (٤٩/٢)

---

٢٨٨. ئیمـامی ابن قتیبـة الـدینـوري دەفـەرمووێت :

پیاوێـك چوو ماڵێ ژنیـكی خانەدان نیـقابەكەی هەڵدابۆیەوە پیاوەكەش قژی بینـی ، ئافـرەتەكە قژی خۆی بڕی و ووتـی : قژێكم ناوێت كەسێك نامەحرەم سەیری كردبێت »

[ سەرچاوە عیون الأخبار (٤/٨٧)]

---

٢٨٩. ئەبو حازم ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی:

سەیرم دێت لە كەسانێك كار بۆ ژیانێك دەكەن كە هەموو ڕۆژێك لێی دوور دەكەونەوە، وازیان هێناوە لە كاركردن بۆ شوێنێك هەموو ڕۆژێك لێی نزیك دەبنەوە.

صفوة الصفوة

---

٢٩٠. مُوَرِّقٌ العِجْلِي - رحمه الله دەڵێت - :

" شتێک زۆر داوام کرد و هەوڵم بۆدا بەدرێژایی ٢٠ ساڵ نەم توانی بەدەستی بێنم وەهەرگیزیش بۆ بەدەس هێنانی کۆڵم نەداوە.

وتیان: جا ئەو شتە چیە ئەی باوکی معتمر ؟

وتـی : بێدەنگی لەوشتـەی پەیوەندی بەمنەوە نیە ! ".

[ الزهد لابن حنبل ]

---

٢٩١. بكر كوڕی عبدالله المزني دەفەرمووێت :

ئێوە تاوان زۆر ئەكەن، بۆیە داوای لێخۆشبوون زۆر بكەن.

#التوبة_لابن_أبي_الدنيا_١٧٩

---

٢٩٢. إبراهيم المغربي دەڵێت:

« گەر نارەحەتیەكانی دونیا نەبونایە ئەوا لە قیامەت موفلیسەبوین » .

[ حلية الأولياء ( ١٢ / ١٦٤ ) ]

٢٩٣. پێشەوا الزُّهري رحمه الله فەرمووی:

«فێر بوونی سوننەت باشترە لە عیبادەتی سەد ساڵ».

» چونکە نەزانینی سوننەت ئینسان توشی بیدعە ئەکات ..» گەرعیبادەتێکیش بیدعەی تێدا بوو قەبوڵ ناکرێت ..» بۆیە عیبادەتێکی کەم موافقی سوننەت بێت باشترە لە عیبادەتێکی زۆر کە پێچەوانەی سوننەت بێت ..

مَسائِل حَرب في الاعتِقاد | ٥٢٧

٢٩٤. إمامی سفیان بن عیینە دەڵێ :

ئەگەر من کارم کرد بەو علمەی کەدەیزانم ئەوا من زاناترین کەسم ، بەڵام ئەگەر کارم نەکرد بەو علمەی کەدەیزانم ئەوا لەدونیادا کەسێک نیە هێندەی من جاهل بێت .

الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع ، للخطيب البغدادي. بەژمارە[ ٣٣ ]

٢٩٥. | قسە کردن بەپێی مەقام و ئاستی خۆت

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ـ رحمه الله ـ ئەفەرمووێ: «ئێمە کاتێ گوێمان لە گەنجێکی تازە پێگەشتوو بووایە لە مەجلیسی زانایاندا قسەی بکردایە بێ هیوا ئەبووین لە خێری».

تاريخ دمشق لابن عساكر (٣٤٤/٦).

٢٩٦. عبدالله ـی کوڕی عەمر (الله لێی ڕازی بێت) ئەیفەرموو: کاتەکانی پێشوو و لە ڕابردوودا کاتێ پیاوێک چاوی بەوی تر ئەکەوت ئەونە بەگەرمیەوە ئەچوو بەدەمیەوەو تێکەڵی ئەبوو بتبینیایە واتئەزانی ئەم دوو کەسە لە یەک دایک و باوکن ، زۆر سەیرە کەوتوینەتە

ڕۆژگارێک گەر ئەمڕۆ یەکێ لە ئێوە کەسێکی تر لە براکانتان ببینن ئەڵێی چاوتان بە دوژمنەکەتان کەوتووە..!

| الزهد والرقائق لابن المبارك

٢٩٧. يحيى بن خلف المقرئ ئەفەرمووێ: هاتم بۆ شاری کوففە و چاوم کەوت بە ابو بکر ی کوڕی عیاش ، پرسیارم لێ کرد چی ئەڵێی دەربارەی ئەو کەسەی کە بڵێ قورئان مەخلوقە ؟! ، فەرمووی : کافرە ، وە هەرکەسێکیش ڕەئی وانەبێ و نەڵێ کافرە ئەوە خۆشی کافرە ، ئینجا فەرمووی ئایا گومان ئەبرێ لەوەی جولەکەو گاور کافر بن؟ جا بزانن ئەوەی گومانی هەبێ لە کافریەتی ئەو کەسانە (جولەکەو گاورەکان) ئەوا کافرە ، ئەوەشی ئەڵێ " قورئان مەخلوقە وەک ئەوانەیە ".

السنة لحرب الكرماني (٣٧٥).

٢٩٨. یەزیدی کوڕی مەیسەرە ئەفەرمووێ: «شێخ و مامۆستاکانمان ناوی دونیایان کردبوویە " الدنية " واتە شتێکی زۆر بچوک و بێ نرخ ، هەر ناوێکی شەڕیان دۆزیبایەتەوە بەوە ناویان لێ ئەنا ، هەر شتێ لە دنیا چوبایەتە بەردەستیان ئەیانوت بۆ خۆت بۆ خۆت پیرۆزت بێ ئێمە بێ پێویستین لێت ، ئێمە پەروەردگاری خۆمان ناسیوە».

حلية الأولياء وطبقات الأصفياء (٥/٢٣٥).

٢٩٩. ئیمامی موجاهید ئەفەرمووێ: یەحیای کوڕەی زەکەریا جارێک پاڕایەوە فەرمووی: یا رب کارێ بکە ئەهلی زەوی باسم نەکەن بە غەیری چاکەو خێر ، الله عز وجل وەحی نارد بۆی پێی فەرموو: ئەی یەحیا ئەمەم بۆ خۆشم نەکردووە ، ئەتەوێ بۆ تۆی بکەم..!

ـ گوێ مەیەرە قسەی خەڵکی ، خەڵک لە الله ـو پێغەمبەرانی ڕازی نییە ، چۆن لە من و تۆ ڕازی ئەبن.!

أصول الاعتقاد | للالكائي صـ٦٩٣

٣٠٠. محمد ـی کوڕی أبي رجاء ئەڵێ: پیاوێکی خەڵکی کوففه جارێکیان بۆی باس کردم ووتی: عمرانی کوڕی حِطَّان که له گەورەیانی تابعین بوو هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ئافرەتێکی بیروباوەڕ خەواریج ووتی بەڵکو بەهۆی منەوە ئەویش بگەڕێتەوە سەر ڕێی ڕاست و لەم گومڕاییە نەجاتی ببێت ، کەچی بەتێپەڕ بوونی کات نەک ئافرەتەکە چاک نەبوو بەڵکو عمران ـیشی هەڵگەڕاندەوەو ئەویش بوویە خەواریج.! (تاریخ دمشق | ٤٩٠/٤٣.)

---

٣٠١. "له هەموو ژیانمـ قسەم لەسەر شتێ نەکردووە پەیوەندی بە منەوە نەبووبێت".

ابو دوجانه (الله لێی ڕازی بێت)

جامع العلوم والحكم | ٢٩٤/١.

---

٣٠٢. سەعیدی کوڕی موسەییب ڕەحمەتی الله ـی لێبێت فەرموویەتی: " شیطان له هەرشتێك بێ هیوا ببێت بۆ ئەوەی پیاوی پێ فریو بدات و لەڕێیەوە گومڕا ببێ ئەوە لەڕێی ئافرەتەوە بۆیان ئەچێت و هەوڵی فریودانیان ئەدات ".

صفة الصفوة ٢/٤٥٤

---

٣٠٣. أبوحازم (سەلەمەی کوڕی دینار) رحمه الله فەرمووی: «هیچ شتێك نییە لە دونیادا کە دڵ خۆشت بکات ،، ئیللا شتێکی پێوە لکاوە و لەگەڵیدایە کە بێتاقەت و دڵ گرانت ئەکات».

ابن أبي الدنيا في الزهد | ٣٨٧

---

٣٠٤. شورەیح رحمه الله ئەیفەرموو: ڕۆژانێک دێن بەسەر خەڵکیدا کە ئەبینی ڕەخنە لە خەڵک ئەگیرێ لەسەر ئیمانەکەیان وەک چۆن خەڵکی ئەمڕۆ ڕەخنەی لێ ئەگیرێ لەسەر خراپەکاریەکەی ، هەتا وای لێیەت بە بڕوادار ئەوترێ هەر بەڕاست تۆ بڕواداری؟!

» واتە دینداری و باس کردنی دین لەناو خەڵک ئەبێتە عەیبەو بەشەرمەوە ئیسلام بۆ خەڵک ڕوون ئەکەیتەوەو ڕووت نایە ئەمرو بە چاکەو نەهی لە خراپە بکەی بەبیانوی گەورەو بچوکی و ڕێزەوە ..!

---

٣٠٥. جارێکیان مالیکی کوڕی دینار تێپەڕی بەلای سەگێکی مردارەوە بوودا ، ڕووی تێ کرد و ووتی ئەوا ئیسراحەتت کرد بۆ خۆت ، نە حسابت لەسەرەو نە کیتاب '

المتمنين لابن أبي الدنيا، صـ ٧٠

---

٣٠٦. بە سوفیانی کوڕی ثەوری وترا بۆچی ئەمر بە چاکە ناکەیت و ڕێگری ناکەیت لە خراپە؟! ،، ئەویش فەرمووی: کە ئاوی دەریا زیادی کرد کێ ئەتوانێ ڕێگری لێ بکات و دای بمرکێنێتەوە؟!

واتە: کە کۆمەڵگە بەرەو فەساد ڕۆشتن خراپە زیاد بوو ، وە تاکەکان ئامادە نەبوون گوێ لە ئامۆژگاری بگرن بەهیوای چاک بوون ، کێ ئەتوانێ ئەمانە ناچار بکات گوێ بگرن و وەڵام بدەنەوە؟

» لەم سەردەمی بێ بەها بوونی قسەکردن و گوێ لێ گرتنەدا ، کێ هەیە ئامۆژگاری وەرگرێ و بگەڕێتەوە بۆ ئەسڵ و بنچینەی دینەکەی؟!

» لەم سەردەمی زۆربوونی خراپەو باوەش کردن بە دونیای پڕ مادی یەدا کێ هەیە دڵی لای دینەکەی بێت و بەتەنگ کەموکوڕیەکانیەوە بێت و بەگوێی دڵ گوێ بۆ حەقیقەت و ڕاستیەکان بگرێ؟!

أخبار الشّيوخ و اخلاقهم

---

٣٠٧. يەحیای كوڕی موعاذ ئەفەرمووێ: "ئارام گرتن لەسەر كردەوەی خەڵك قورسترە لە ئارام گرتن لەسەر گەرمی ئاگر".

حلية الأولياء

---

٣٠٨. ڕەبیعی كوڕی نافع ـی حەلەبی (أَبُو تَوْبَةَ) ئەفەرمویّ: گوێم لیّ بوو یوسف ـی كوڕی أسباط ئەیفەرموو: «نابینم خوای گەورە سزای مخلوقات و درووستكراوەكانی بدات ئیللا بەهۆی تاوان و هەڵەی عالم و زاناكانەوەیە».

» گەر عالم و زاناكان خراپەكارو موفسید بوون ئیتر خەڵكی عام چاو لە كێ بكات و گوێ بۆ كێ بگرێت تا چاك و دوور لە خراپە كردن بێت ، تا بگەڕێتەوە بۆ دین ، تا فێری تەوحید ببێت؟!..

المَجالَسَة وجَواهِر العِلْمْ

٣٠٩. عبدالله ـی كوڕی عەباس الله لێی ڕازی بێت ئەیفەرموو: هیچ كەس نییە زیادەڕەوی كردبێت لە باس و خواستی قەدەر ئیللا لە دینی ئیسلام چۆتە دەرەوە». (السنة للخلال)

---

٣١٠. إبراهیی كوڕی ئەشعەث " رحمه الله " ئەیفەرموو: هەركەسێ تێكەڵاوی خەڵك بكات ئەوا سەلامەت نابێت و دەربازی نابێت لە یەكێك لەم دووانە:

» یان ئەوەیە لەگەڵ ئەواندا ئەچێتە نێو باطل (ناحەق) لەو كاتەی ئەوان ئەڕۆنە ناویەوە.

» یان ئەوەیە بێدەنگ ئەبێت كاتێك خراپەیەك ئەبینێت ، یان گوێی لیّ ئەبێت لەوانەی كە لەگەڵی دانیشتوون ، ئەویش خراپەكە ناگۆڕێت بۆیە تاوانبار ئەبێت و ئەبێتە هاوبەشی خراپەكە.

العزلة لابن أبي الدنيا صـ٤٥

---

٣١١. ڕەبیعی کوڕی خوثەیم ڕەحمەتی لێ بێت ئەیفەرموو: «هیچ نادیارێک نییە کە ئیماندار چاوەڕێی بێ و بۆشی خێر بێت وەک لە مردن».

مصنف ابن أبي شيبة ١٤٥/٧

---

٣١٢. ابو عمرانی جەونی ئەفەرمووێ: «هیچ عەبدێک نییە کە الله تعالى سەیری بکات ئیللا ڕەحمی پێ ئەکات , هەتا ئەگەر سەیری ئەهلی دۆزەخیش بکات ڕەحمیان پێ ئەکات و لێیان خۆش ئەبێت , بەڵام الله تعالى ئەوەی بڕاندۆتەوە کە بەهیچ جۆرێک تەماشای ئەهلی دۆزەخ ناکات».

» ڕەحمی الله فراوانە بەڵام لە قیامەت تەنها بۆ ئیماندارانە.

حلية الأولياء

---

٣١٣. زۆربەی ڕۆژەکان طاوسی کوڕی کەیسان لەماڵەوە ئەمایەوەو نەئەڕۆشتە دەرەوە ، لێیان پرسی بۆچی زۆربەی کاتەکانت لە ماڵەوە ئەمێنیتەوەو ناچیتە دەرەوە؟! , فەرمووی: لەبەر تێکچوونی دەسڵاتداران و خراپ بوونی خەڵک ..

مداراة الناس

---

٣١٤. موعتەمەری کوڕی سولەیمانی بەصری ئەفەرمووێ: «باوکم نامەیەکی بۆ ناردم ئەوکات من لە شاری کوفە بووم ، لە نامەکەیا بۆی نووسیبووم: وەرەقە بکڕەو عیلم بنوسەرەوە ، چونکە ماڵ ئەفەوتێت بەڵام عیلم ئەمێنێتەوە کوڕەکەم».

الجامع لشعب الإيمان | جـ٣

---

٣١٥. پێشەواو قودوە مەسروقی کوڕی ئەجدەع ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەیفەرموو: هەرکەسـ پێی خۆشە زانیاری هەبێ بە عیلمی سەرەتاو کۆتایی ، وە زانیاری هەبێ بە زانستی دونیاو دواڕۆژ ئەوە با سورەتی " الواقعة " بخوێنێیت و لێی وورد ببێتەوە». ١

احمد : وە سورەتی (الواقعه) یەکێکە لە هاودەستەکانی سورەتی هود کە رسول الله ﷺ دەربارەیان دەی فەرموو: (پیریان کردم سورەتی هود و هاودەست و خوشکەکانی).

» بۆیە فەرموی: خوشکەکانی ، چونکە (سورة) لە عەرەبیدا وشەیەکی (مؤنثه) بۆ مێ بەکار دێت ئەگەر نا سورەتەکانی قورئان وەک خودی خۆیان وەسف ناکرێن بە مێ یاخود نێر ، وە هەموو قورئان وتەو قسەی الله یە عز وجل ..

المصنف لابن أبي شيبة

---

٣١٦. مەیمونی کوڕی میهران رحمه الله ئەیفەرموو: «عبدالله ـ ی کوڕی عومەر رەزای خوای گەورەیان لێ بێت سورەتی البقرة ـ ی بە چوار ساڵ لەبەر کرد ،، ئەمە لەبەر لاوازی حفظ کردنیان نەبووە بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە هاوەڵان هەر ئایەتێکیان لەبەر بکردایە هەموو ئەو باسانەی ئەو ئایەتە دەیگرتە خۆی ضبط یان ئەکردو فێری ئەبوون».

» بۆیە گرنگە طالبی علم علمەکان کەم کەم فێر ببێت و صبری لەگەڵدا بگرێت ..

الطبقات

---

٣١٧. محمدی کوڕی یحیی ئەفەرمووێ: «ووتمان بە ضەحاکی کوڕی موزاحیم : ئەی باوکی قاسم نەماندیوە وەک فڵان کەس خواپەرست و خاوەن وەرع و خوێنەری قورئان بێت ،، باوکی قاسم

فەرمووی عەقڵی چۆنە؟! ،، ئێمەش ووتمان: ئێمە باسی عیبادەت و وەرع و قورئان خوێندنیمان کرد کەچی تۆ باسی عەقڵی ئەکەیت...؟! ،، فەرمووی: ئای بە هیلاک بچن ، ئەونەی کەسی بێ عەقڵ بەهۆی گەمژەیی خۆیەوە تووشی خراپەکاری ئەبێت ، ئەوندە کەسی خراپەکار بەهۆی خراپەکانییەوە تووشی زیان و زەرەر نابێت».

» العقل وفضله " صـ٤٦

---

٣١٨. هەرکات عَطَاءٌ السَّلِيْمِيُّ رحمة الله عليه تەواو ببوایە لە دەست نوێژ گرتن ، ئەکەوتە ژێر کاریگەری ترس و خەمێکی گەورەوەو لەرزی لێ ئەهات و ئەگریا بە گریانێکی توند .. لێیان پرسی لەسەر ئەو حاڵە؟! ,, فەرمووی: من ئەمەوێ بڕۆم کارێکی گەورە ئەنجام بدەم , ئەمەوێ لە بەردەستی الله تعالی ـدا بووەستم و نوێژ بکەم ..

هاوڕێکانی دەربارەی فەرمویانە: کاتێ عَطَاءٌ بگریایە سێ شەو و ڕۆژ نەئەهاتەوە سەرخۆیی و فرمێسکی وشک نەئەبویەوە ..

عَطَاءٌ السَّلِيْمِيُّ البَصْرِيُّ لە تابعیە بچوکەکانەو خەڵکی بەصرە بووە , گەشتووە بە أنس ـ ی کوڕی مالک و حەسەنی بەصری و جعفر ـ ی کوڕی زید .. ئەوترێ نزیکی ساڵی ١٤٠ ـ ی هجری وەفاتی کردووە ..

صِفَّة الصَفْوَة

سِيرَ أعلام النُّبَلاءْ

---

٣١٩. إبن عبدالبَر ئەڵێ: ووتەی الله کە ئەفەرموێ: " ڕۆژوو بۆ منەو خۆم ئەزانم چۆن پاداشتی ڕۆژو ـوەوان ئەیەمەوە " کافیەو بەسە بۆ ئەوەی بزانین کە چۆن فەزڵی ڕۆژوو بەتەنها دراوە بەسەر هەموو عیبادەتەکانی تردا ..

سنن البيهقي | ٥٨٦/٥

---

٣٢٠. مەیمونی کوڕی میهران رحمه الله ئەی فەرموو: نمونەی ئەو کەسەی کە کەسێکی تر ئەبینێت نوێژەکەی بەهەڵە ئەکات و ئەمیش بۆی ڕاست ناکاتەوە ، وەک ئەو کەسەیە کە کەسێک ئەبینێ خەوتوەو وا مارێک ئەیەوێ بیگەزێت و پێوەی بدات بەڵام ئەمیش بەخەبەری ناهێنێ ..! ١

احمد: ئێمەش بەگوێرەی توانامان هەوڵ ئەدەین خەڵکی بەخەبەر بهێنین لە کوفرو شرک ، گەر کەسێک جوابی داینەوە و حەقی وەرگرت شوکری الله ئەکەین ،، ئەگەر هەر لەسەر کوفریش بەردەوام بوو ئەوە ئێمە گەیاندنمان لەسەرە و لای الله عوزرمان ئەبێت کە ئێمە گەیاندمان و خەڵکی جوابی دەعوەی حەقیان نەدایەوە ..

فتح الباري لابن رجب | ٣/١٤٤

---

٣٢١. حەسەنی کوڕی یەحیای خوشەنی ئەڵێ: «هەرکەس ئەیەوێ فرمێسک بەخوڕ لەچاوی بێتە خوارەوەو دڵی نەرم ببێت .. با نیوەی سکی پڕ بکات لە خواردن و خواردنەوەو زیاتر نەخوات».

تأريخ مدينة دمشق

---

٣٢٢. مالک ـی کوڕی دینار " رحمه الله " ئەفەرمووێ: «ئەگەر خوای گەورە توڕە ببێت لە قەومێک ، منداڵ و کەسە بچوکەکانیان زاڵ ئەکات بەسەر گەورەکانیاندا» ..

العقوبات ,, صـ ٦٠

---

٣٢٣. ڕۆژێکیان أبو الدَّرداءِ لەگەڵ جەنازەیەک بوو , بینی کەسـ و کاری مردووەکە وا ئەگرین , ئەویش فەرمووی: ئەمانە هەژارن , مردووی سبەینێ لەسەر مردووەکانی ئەمڕۆ ئەگرین ..!

الزهد لأبي حاتم

---

٣٢٤. عبدالله ـی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت ئەی فەرموو: ئێوە هێشتا سەلامەتن مادام کاتێک کەسێکتان شتێک لە دڵیدا دروست ئەبێت کەسێکی تر ئەناسێت لە خۆی زانا تر بێت و ئەچێت بۆ لایی و پرسیاری لێ ئەکات و ئەویش بۆی ڕوون ئەکاتەوە و نەجاتی ئەبێت لەو کێشەیەی بۆی دروست بووە , بەڵام سوێند بە الله نزیکە ئەوەش نەمێنێت و کەسێک پرسیاری هەیەو کەسی دەست نەکەوێت علمی پێ بێت و لێی بپرسێت ..

العلم والحلم لأبي إياسـ ٦٤

---

٣٢٥. إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ ئەفەرموێ: إمام مَسْرُوقٍ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەی فەرموو: «هیچماڵێک نییە بۆ ئیماندار باشتر بێت لە گۆڕ ,, تێیدا ئیسراحەت ئەکات لە غەم و ناڕەحەتی دونیاو لە عەزابی خوای گەورەش پارێزراو ئەبێت».

الزُهد لِوَكِيع بن الجَرَّاح | صـ ٣١٣

---

٣٢٦. مَالِكُ بْنُ دِينَارٍ ڕەحمەتی خوای لێ بێت

ئەی فەرموو: «خەم و بێتاقەتی سوتاندمی».

» بێگومان خەمی قیامەت ، والله اعلم

الهمُّ والحزنُ لابنِ أبِي الدُّنيا

---

٣٢٧. بلال ـی کوڕی سەعد رَحِمَهُ اللَّهُ ئەفەرموێ: «خوای گەورە لە تاوان خۆش ئەبێت بەڵام لە دەفتەری کردەوەکاندا نایسڕێتەوەو لە قیامەتدا خاوەن تاوان ڕائەگرێت و پێی پیشان ئەداتەوە هەرچەند تەوبەشی لێ کردبێت».

صِفَة الصّفوَة ٤/٢١٧

---

٣٢٨. عبدالرحمن ـى ی کوڕی حاتم ئەڵێ: «لە وڵاتی مصر بووین ماوەی حەوت مانگ ,, ئەو ماوەیە شلەمان تێدا نەخوارد (لەبەر کەم مەجالی) ڕۆژەکانمان دابەشکردبوو بۆ دانیشتن لە دەرسی شێخەکاندا ,, بە شەویش ئەوەی وەرمانگرتبوو دەمان نوسیەوە و لێ پرسینەوەمان دەکرد ,, ڕۆژێک من و هاوڕێیەکی شیخەکەمان پێکەوە بووین وتیان ئەوە نەخۆشە (واتە عبدالرحمن کوڕی حاتم) ئەڵێ لە ڕێگا ماسیەکمان دی سەرسام بووین پێی هەنێکمان کڕی ,, کاتێک گەڕاینەوە بۆ ماڵ کاتی دەرس هات نەمان توانی چاکی بکەین ,, ڕۆشتین بۆ دەرس ,, سێ ڕۆژ بەردەوام ئەوە حاڵمان بوو نەمان توانی ماسیەکە چاک بکەین تا خەریک بوو تێک دەچوو بۆنی دەکرد ,, بۆیە بە کاڵی خواردمان , مەجالی ئەوەشمان نەبوو بیدەینە کەسێک بۆمان ببرژێنیت ,, پاشان وتی : علم بەدەست نایەت بە جەستەی ئیسراحەتەوە بەڵکو دەبێت خۆت ماندوو بکەیت بۆی».

تذکرة ٣/٣٣٨

---

٣٢٩. حاتەمی ئەصەم رحمە اللّٰہ فەرمووی: «نوێژێکی جەماعەتم لە دەست چوو تەنها أَبُو إِسْحَاقَ الْبُخَارِيُّ سەرەخۆشی لێ کردم ، خۆ ئەگەر مناڵێکم بمردایە زیاد لە دە هەزار کەس سەرەخۆشیان لێ ئەکردم ، چونکە موصیبەتی دین لای خەڵک زۆر ئاسانترە لە موصیبەتی دنیا».

الزواجر (١/٢٣٨)

---

٣٣٠. يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ ئەڵێ: چومە لای أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ کە نەخۆش کەوتبوو پێی ووتم: ئەگەر ئەتوانیت بمریت بمرە ، سوێند بەخوا ڕۆژێک دێت بەسەر خەڵکیدا مردن خۆشەویست ترە لەلای هەریەکەیان وەک لە بەدەست هێنانی ئاڵتونی سوور ..

العُزْلَة لِلْخَطَّابي ,, صَفْحَة | ٧٨

---

٣٣١. هەندێ لە پیاو چاكان فەرموویانە: «نمونەی هاوڕێی باش وەك برا وایە لە كوێ هەیە؟ ,, خزم و كەس و كار میراتەكەت دابەش ئەكەن بەڵام ئەو بە تەنها ماوەتەوەو خەمت لێ ئەخوات و دوعات بۆ ئەكات ئەو كاتەی تۆ لە ناو چینەكانی زەویدایت (لە گۆڕدایت)».

مجموع رسائل إبن رجب | ٢/٤٢٣

---

٣٣٢. عبدالله ـ ی كوڕی مەسعود خوای گەورە لێی ڕازی بێت ئەی فەرموو: «بەڕاستی ڕۆژێك دێت بەسەرتاندا .. ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە مردنتان دەست بكەوێت بە پارە ئەیكڕێت».

الزهد لمعافی بن عمران

---

٣٣٣. صەحابی خۆشەویست حوزەیفەی كوڕی یەمان ئەفەرموێ: سەردەمێك دێت بەسەرتاندا پیاو ئاواتی مردن ئەخوازێت بەڵام ئەكوژرێت یان كافر ئەبێت و لە ئیسلام هەڵ ئەگەڕێتەوە ، سەردەمێك دێت بەسەرتاندا ئاواتی مردن ئەخوازن خاوەن سامانن و فەقیریش نین ..

مُصنف إبنُ أبي شَيبَة ٣٨٥٠٥

---

٣٣٤. حیممانی ئەڵێ: كاتێك ابو بكری كوڕی عەیاش گەشتە سەرە مەرگ خوشكەكەی لای دانیشتبوو بۆی ئەگریا , ئەویش فەرمووی: مەگری بۆچی ئەگریت , دواتر ئیشارەتی كرد بۆ سوچێك لەماڵەكەیی و ووتی: براكەت ١٨ هەزار خەتمی قورئانی كردووە ئا لەو شوێنەیا.

| الحلية الأولياء

---

٣٣٥. یوسف ـ ی كوڕی أسباط رحمه الله دەیفەرموو: «ئەگەر هەردوو دەست و هەردوو قاچم ببڕنەوە خۆشەویست ترە لام لەوەی هەدیەی ئەمیرو سوڵتانێك قبوڵ بكەم» ..

سەلەف ـی ئومەت پێیان خۆش نەبووە لە ئەمیرێکی ئیمانداریش نزیک بن چ جای ببنە کۆیلەی طاغوتێک ..

حلية الأولياء

---

**٣٣٦.** ئیمام سوفیانی ثەوری رحمە اللە ئەی فەرموو: «ئەگەر ویستت کچێک بخوازیت ئەوە هەدیەیەک ببە بۆ دایکی لە پێشدا».

مەبەستی ئیمام لەوەیە کاتێک چویتە داوای هەدیەیەک بەریت بۆ دایکی کچەکە تا دڵی ڕاکێشیت و بە کەسێکی عاقڵت بزانن ..

مسند ابن الجعد للبغوي | رقمـ ١٨٤٢

---

**٣٣٧.** أبو بکری کوڕی عیاش دەگێڕێتەوە دەڵێت جارێک لە مەجلیسی ئیمام ئەعمەش ـدا دانیشتبوین و فەرمودەکانمان ئەنوسیەوە کە پێی ئەوتین ، پیاوێک لەوێوە تێپەڕی وتی: ئەی باوکی محمد ئەوە چییە ئەو منداڵانە لە چوار دەورتدا؟! ... ئەویش فەرمووی: «ئەمانە ئەو کەسانەن کە دینەکەت بۆ ئەپارێزن و لەبەری ئەکەن». ١

وە عبدالرزاق ـی کوڕی هومام دەفەرموێت: لە صەنعاء سوفیانی سەوریم بینی حدیث ـی پێغەمبەری خوای بە منداڵێک ئەوتەوە». ٢

1 المحدث الفاصل | صـ٥٩.

2 سير للذهبي وحلية الأولياء.

---

**٣٣٨.** عبداللە ـی کوڕی باوکی صالح ئەفەرمووێ طاوسی کوڕی کەیسان هات بۆ لام و لەو کاتەدا نەخۆش بووم , ووتم ئەی باوکی عبدالرحمن دوعای شیفام بۆ بکە .. پێشەوا طاوس رحمە اللە فەرمووی: «بەڵکو خۆت دوعا بکە بۆ نەفسی خۆت ، بەڕاستی خوای گەورە وەڵامی ئەوانە ئەداتەوە لێیان قەوماوەو بە هانایانەوە دێت گەر لێی بپاڕێنەوە».

المرض والكفارات , صـ٧٢

٣٣٩. ئیبراهیمی نەخەعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەیفەرموو: سەردەمێک دێت بەسەر خەڵکیدا پێی ئەوترێ سەردەمی گورگەکان ,, هەر کەسێ لەو سەردەمە سەگ نەبێ ئەیخۆن ..

الزهد الكبير

٣٤٠. صلە ی کوڕی ئەشیەمی عەدەوی لە دوعاکانیدا ئەیفەرموو: یا ربی تەنها دوورم بخەرەوە لە دۆزەخ هەتا گەر شایەنی بەهەشتیش نیم ..

البداية والنهاية

٣٤١. یوسف ی کوڕی أسباط رحمه الله دەیفەرموو: «ئەگەر هەردوو دەست و هەردوو قاچم ببڕنەوە خۆشەویست ترە لام لەوەی هەدیەی ئەمیرو سوڵتانێک قبوڵ بکەم» ..

سەلەف ی ئومەت پێیان خۆش نەبووە لە ئەمیرێکی ئیمانداریش نزیک بن چ جای ببنە کۆیلەی طاغوتێک ..

حلية الأولياء

٣٤٢. موغیرەی کوڕی أبو صالح ئەڵێ: مالک ی کوڕی دینار ووتی شتێکت پێ ئەڵێم لێم وەرگرە: هەر برایەک , هەر هاوڕێیەک , هەر مەجلیسێک کە ئەزانی سوودی لێ نابینیت و کەڵکی بۆت نییەو تووشی خێرت ناکات لە ئەمرو کاروباری دینەکەت لێی دوورکەوە ..

أخرجه عاصم في الزُّهد

٣٤٣. لەو کاتەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حنبل تووشی تاقیکردنەوەکەی بوو , بە بشر بن حارث الحافي ووترا: تا ئێستە ئیمام ئەحمەد حەڤدە قامچی لێ دراوە لەلایەن پاسەوانەکانەوە لە زیندان ، بشر

هەردوو پێی ڕاکشان و تەماشای کردن و فەرمووی: چەند ناشرینن ئەم دوو پێیە گەر کۆت و زنجیری پێوە نەبێت بۆ سەرخستنی ئەو پیاوە ..

المناقب:١١٩

---

٣٤٤. لە تەفسیری ئایەتی (إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ) .. إبن زەید رحمە الله فەرمووی: مەبەست پێی سەلامەتی دڵە لە شیرک ، ئەگەر نا کەس نییە لە ئێمە دڵی سەلامەت بێت لە تاوان ..

تفسير الطبري

---

٣٤٥. لە بەردەم خاڵم بووم یاریم ئەکرد , ئەوکات تەمەنم حەوت ساڵان بوو ، لە بەردەمی خاڵم ژمارەیەک زانا دانیشتبوون باسی سوپاسگوزارییان ئەکرد , خاڵم پێی ووتم: ئەی مناڵ سوپاسگوزاری چییە؟!

منیش ووتم: ئەوەیە سەرپێچی الله نەکەیت بەو نیعمەتانەی کە پێتی داوە , خاڵم پێی ووتم: ئەترسم بەشی تۆ بەرامبەر الله تەنها زمانت بێت , ("واتا تەنها گوفتارت هەبێ و بێ کردار بیت") ,, بەردەوام لەو کاتەوە ئەگریم کە خاڵم ئەو قسەیەی پێ ووتم ..

» ئەمە بەسەرهاتی جونەید ـی بغداد ـیە

لەگەڵ خاڵی بەناوی السري السقطي ..

أبو الحَسَن سَّرِيُّ الدِّين بنُ الـمُغَلِّسِ السَّقَطِيُّ پیاوێک عابد و زاهدی بۆ خوا سوڵحاو بووە , ساڵی ١٦٩ هجری لە دایک بووە لە بەغداد ,, وە لە ساڵی ٢٥١ هجری هەر لە بەغداد وەفاتی کردووەو یەکێک بووە لەو کەسانەی بانگەوازی تەوحیدی کردووە ..

تاریخ بغداد للخطیب ٧/٢٥٢

---

٣٤٦. يحيى بن معاذ - رحمه اللّٰه دەڵێت :-

"براكەت ئەو كەسەيە عەيبەكانت پێ دەناسێنێت ، هاوڕێكەت ئەو كەسەيە ئاگادارت دەكات لە تاوان".

صفة الصفوة (٢/ ٨٧)

---

٣٤٧. حوزەيفەی مەرعەشی تەماشای گەنجێكی كرد زۆر بەكوڵ دەگريا لێی نزيك بويەوە و پێی وت:

بۆ دەگری ئەی گەنج؟

ئەويش، بەدەم گريانێك كەچاوەكانی سوريان دەنواند، وتی : تاوانەكانی ڕابردووم بير دێت كەكردوو من.

حوزەيفەش وتی : بەڵێ ڕۆڵە بەوێنەی تاوان گريان پێويستە.

پاشان خستيە تەنيشتی خۆی و پێكەوە دەگريان.

الرقة و البكاء لإبن أبي الدنيا ٤٨٤١

---

٣٤٨. إبن المبارك (١٨١هـ) رحمه الله دەڵێت : جەهميەكان هيچ شتێك ناپەرستن .

[كتاب السنة لعبد الله{١٧}]

---

٣٤٩. پێشەوا موزەنی دەڵێت : زۆر ئاگاداری كردنی قسەيەك بە ئەگەر ڕاست بكەيت پاداشتی لەسەر وەرناگريت ، وە ئەگەر هەڵەت كرد لەسەری تاوانبار دەبيت ، ئەو قسەيەش بريتييە لە گومانی خراپ بردن بە براكەت !! .

إمام الذهبي

---

۳٥۰. فضيل كوڕی عياض دەفەرموویت : نابێت خاوەن سونەیەک لایەنگری خاوەن بیدعەیەک بکات ئیلا ئەوا جۆرێکە لە جۆرەکانی دووڕوی.

ولا يكن صاحب سنة يمالئ صاحب بدعة إلا نفاقا .

شرح_السنة_۱۳۸

---

۳٥۱. هەندێك لە پێشینی باشمان فەرموویانە :

ئەوەی لە خودا بترسێ ، هەموو شتێك لێی ئەترسێت ، ئەوەشی لە خوا نەترسێ ، خودا وای لێدەکات لە هەموو شتێك بترسێت .

| بدائع الفوائد ۲/۲٤٥ |

---

۳٥۲. پرسیارکرا لە حذيفه رضي الله عنه: منافق كێيه؟

فەرمووی: ئەو کەسەیە کە وەصفی ئیسلام ئەکات و کاری پێ ناکات..!

حلية الاولياء ۱/۳٥۱

---

۳٥۳. فضيل ی کوڕی عیاض دەڵێت

۱_ سەردانی ئەوان بکە کە سەردانت ناکەن

۲_ببەخشە بەوانەی کە پێت نابەخشن (وەنابەخشن بەکەس)

۳_لەوانەش خۆشبە کە زوڵمت بەرامبەردەکەن

ئەوانە لە ئەخلاقی دونیا و ئاخیرەتە (بۆموسولمان) واتە سودی بۆ دونیا و قیامەتت دەبێت

قال الفضيل بن عياض: «أخلاق الدنيا والآخرة أن تصل من قطعك، وتعطي من حرمك، وتعفو عمن ظلمك»

مكارم الأخلاق للخرائطي (۷۷)

---

٣٥٤. كان التابعي محمد بن حسين - رحمه الله - يقول في دعائه:

«اللهم أرزقني امرأة:تسرني إذا نظرت، وتطيعني إذا أمرت، وتحفظني إذا غبت».

تابعي بەڕێز محمد ـی کوڕی حسين رحمه الله لە دوعاکەی دەیفەرموو:

« پەروەردگارم ئافرەتێکم پێببەخشە دڵ خۆشم بکات: ئەگەر بینیم، وە گوێڕایەڵم بێت ئەگەر فەرمانم پێکرد، وە نهێنیەکانم بپارێزێت ئەگەر لەلای نەبووم ».

بهجة المجالس - ١٨٣

---

٣٥٥. كان المفضل بن فضالة (١٨١هـ) إذا صلى عصر يوم الجمعة خلا في ناحية المسجد وحده فلا يزال يدعو حتى تغرب الشمس.

پێشەوا المفضل ـی کوڕی فضالة (١٨١هـ) کاتێک نوێژی عەسری دەکرد لە ڕۆژی جومعەدا بەتەنیا لە گۆشەیەکی مزگەوت دادەنیشت و هەر دوعای دەکرد تاکو ڕۆژ ئاوا دەبوو.

أخبار القضاة (٣/٢٣٨)

---

٣٥٦. قال الإمام عبد الرحمن بن مهدي (١٣٥ - ١٩٨ هـ) :

كان الأوزاعي يقول: " ليس هذا زمن تَعَلُّمٍ هذا زمن تَمَسُّك ".

ئیمامی عبدالرحمن ـی کوڕی مهدي (١٣٥-١٩٨هـ) دەڵێت:

ئیمامی الأوزاعي دەیفەرموو: « ئەم زەمانە زەمانی فێر بوون نیە زەمانی دەستگرتنە - بە قورئان و سوننەت و مەنهەجی سەلەف - ».

[ كتاب السنة لعبد الله بن أحمد بن حنبل صـ ٣٠٣]

---

٣٥٧. حـدَّثنا حفص بن عمر الأردبيلي، قال: حدَّثنا أبو حاتم، قال: حدَّثنا حسن بن عبد العزيز الجّروي، قال: كان الشَّافعي ينهى النَّهي الشَّديد عن الكلام في الأهـواء ، ويقول: " أحدهم إذا خالفهُ صاحبهُ قال: كفرتَ، إنما يقال فيه: أخطأتَ ".

پێشەوا حسن ـی کوڕی عبد العزيز الجّروي، دەڵێت: ئيمامی الشَّافعي زۆر بەتوندی ڕێگری لە عيلمی کەلام و ئارەزوو دەکرد ، وە دەيفەرموو: « يەکێکيان ئەگەر هاوڕێکەی موخالەفەی کرد پێی دەڵێت: کوفرت کرد ، لە جياتی بڵێ: هەڵەت کرد ».

الإبانة الكبرى لإبن بطة العُكْبَرِّيّ (١/٢١٨)

---

٣٥٨. [ ذِكرُ وَفَاةِ شَيخِ الإسلَامِ إبنُ تَيّمِيَّة رَحِمَهُ اللّٰهُ ]

قال العلامة إبن كثير - رحمه الله - :

« ماتَ إبنُ تيمية، فكشفتُ عن وجهه وقبَّلتُه، وقد علاهُ الشَّيبُ أكثر مما فارقناه، لم يتركْ ولداً صالحًا يدعو له، لكنه تركَ أُمَّةً صالحةً تدعو له ».

پێشەوا إبن كثير - رحمه اللّٰه - دەڵێت:

« کاتێک إبن تيمية وەفاتی کرد، سەيری دەمو چاويم کرد وە ماچم کرد، سەری سپی ببو زياتر لەو کاتەی لەگەڵمان بوو، مناڵێکی چاکی لە دوای خۆی جێ نەهێشت دوعای بۆ بکات، بەڵکو ئوممەتێکی چاکی لە دوای خۆی بەجێ هێشت دوعای بۆ بکات ».

البداية والنهاية ؛ (٩/٣٢٩)

---

٣٥٩. ( الأخلّآء يومئذٍ بعضهم لبعضٍ عدوٌّ إلّا المُتَّقين )

هەوەڵی بەڕێز إبن عباس، وە تابيعی مجاهد و قتادة دەڵێن دەربارەی ئەم ئايەتە پيرۆزە: «صارت كلُّ خلّة عداوة يّوم القيامة إلا المتّقين».

واته: هاوڕێ و خۆشەویست هەموویان دەبنە دژمن لە ڕۆژی قیامەتدا جگە لە الله ترسەکان نەبێت (موتەقیەکان).

تفسير إبن كثير؛ سورەتی الزخرف

---

٣٦٠. پێشەوا ابن قدامة المقدسي رحمه الله لە « المغني » دەفەرمووێت:

علي کوڕی أبي طالب - رضي الله عنه - دەفەرمووێت:

« پێم گەیشتووە کە ئافرەتەکانتان پێشبڕکێ لەگەڵ پیاوان دەکەن لە بازاڕەکاندا، ئێوە غیرە ناکەن؟ بزانن خێر لە کەسێک نیە غیرە نەکات »

وە محمد ـی کوڕی علي کوڕی الحسين دەڵێت:

« إبراهيم عليه السلام غیرەی ئەکرد، وە هەر کەسێک غیرە نەکات ئیللا دڵی تێکچووە ».

المغني لابن قدامة - بەرگی ١٠ - لاپەڕە ٢٣٥.

---

٣٦١. قال ابن الجوزي البغدادي - رحمه الله - :

« ورُبّ زواج حدث منه ولد مثل الشافعي وأحمد بن حنبل فكان خيرا من عبادة ألف سنة ».

إبن الجوزي البغدادي - رحمه الله - دەڵێت :

« لەوانەیە لە هاوسەرگیری منداڵێکی وەکو شافعی و أحمد ـی کوڕی حنبل لە دایک ببێت ، پاداشت و خێری زیاترە لە هەزار ساڵ عیبادەت ».

تلبيس إبليس - ص٢٦٣

---

٣٦٢. قال الإمام الشافعي: «قالت لي عمتي ونحن بمكة رأيت في هذه الليلة عجباً، قلتُ: وما هو؟ قالت: كأن قائلًا يقول: مات الليلة أعلم أهل الأرض، فحسبنا تلك الليلة، فإذا هي ليلة مات فيها مالك»

ئیمامی شافعی دەفەرموویت: «کاتێک لە مەککە بووین پورم پێی وتم: ئەم شەو شتێکی سەیرم بینی، وتم: چی بوو؟ وتی: هەستم کرد کەسێک دەیوت ئەم شەو زاناترین کەسی سەرزەوی وەفاتی کرد، دواتر سەیری شەوەکەمان کرد دەرچوو ئەو شەوە بووە کە مالك وەفاتی کردوە»

ترتيب المدارك للقاضي عياض (٢/١٤٨)

---

٣٦٣. أوصى الشّافعي تلميذه الرّبيع بن سليمان، فقال له: «وإذا أردت صلاح قلبك أو ابنك أو أخيك، أو من شئت صلاحه، فأودعه في رياض القرآن، وبين صحبة القرآن، سيصلحه الله شاء أم أبى»

ئیمامی شافعی وەسیەتی قوتابیەکەی خۆی الربيع ـی کوڕی سليمان کرد، پێی فەرموو: «ئەگەر ویستت دڵت چاک بێ یان کوڕەکەت یان براکەت یان هەر کەسێک ویستت چاک بێت، ئەوە بیسپێرە بە ژینگەیەکی قورئان، وە لەنێوان هاورێیانی قورئان، پەروەردگار چاکی دەکات، بیەوێت یان نەیەوێت»

حلية الأولياء لأبي نعيم (٩/١٢٣)

---

٣٦٤. «والحاصل أنهم متفقون: يعني علماء السلف على أن الإشتغال بالعلم أفضل من الإشتغال بنوافل الصوم والصلاة والتسبيح، ونحو ذلك، فإن نوافل البدن هذه، نوافل الصلاة والصيام والصدقة هذه نفعها لصاحبها فقط، ولكن نفع العلم ينفع صاحبه والمسلمين»

«زانایان یەکدەنگن: واتە سەلەف لەسەر ئەوەی سەرقاڵ بوون بە عیلم باشترە لە سوننەتەکانی ڕۆژوو و نوێژ و زیکر کردن، وە هاوشێوەکانیان، چونکە سوننەتی جەستەییە، سوننەتی نوێژ و ڕۆژوو و بەخشین سوودەکەیان بۆ خاوەنەکەیە تەنها، بەڵام سوودی عیلم سوودی بۆ خاوەنەکەی و موسڵمانانە»

كتاب المجموع (١/٢١).

---

٣٦٥. أبو الجوزاء فەرموویەتی :

گواستنەوەی بەرد لەسەر مونافیقین ئاسانترە لە خوێندنی قورئان .

• نَقلُ الحِجارةِ أهْوَنُ على المُنافِق مِن قِراءَةِ القُرْآن • .

' حلية الأولياء ، ٣ | ٨٠

---

٣٦٦. ابن عباس (٦٨هـ) دەفەرمووێت:

زمانی ئەهلی بەهەشت، زمانی عەرەبییە.

صفة الجنة لابن أبي الدنيا ٢١٨

---

٣٦٧. زوهری دەڵێت : فێربونی سونەت باشترە لەعیبادەتی چل ساڵ

سنه لحرب الكرماني

---

٣٦٨. یەكێک لە پیاو چاكان ئەیوت:

مردن ئاسانترە لام لەوەی كەسێك ڕوخساری خێزانەكەم ببینێت.

[المغني لابن قدامة:(٧/٣٠١)]

---

٣٦٩. قال الأوزاعي(رحمه الله): عليك بآثار السلف، وإن رفضك الناس، وإياك وآراء الرجال، وإن زخرفوه لك بالقول، فإن الأمر ينجلي وأنت على طريق مستقيم.

پەیوەستبە بە ڕێگای پێشینان، ئەگەرچی خەڵكیش ڕەتیان كردیەوە ، وە وریای بیرو بۆچونی ئەم و ئەوبە، ئەگەرچی ڕایانزاندەوەش بۆت بە وتەی ڕازاوە، دواتر ڕێگاكە خۆی ڕوون دەبێتەوە، وە تۆش بۆت دیار دەكەوێت كە لەسەر ڕێگای ڕاستی.

أخرجه ابن عبدالبر في (جامع بيان العلم وفضله) ٢/ ١٤٤ .

وأخرجه الهروي في (ذم الكلام )برقم ١١٦.

---

٣٧٠. تابیعیەی بەڕێز حفصة ـی کچی سیرین ئەیفەرموو :

ئەی گەنجینە هەوڵ بدەن، بەڕاستی هەوڵدان لە گەنجیەتیدایە

اقتضاء العلم العمل : ١٩٠

---

٣٧١. طلحة بن مصرف- رەحمة الله ی لێبێت دەفەرمووێ:

هەموو ئەوە مەڵێرەوە کە دەبیستی؛ ئیلا ئەوە نەبێ:

کە ئەوی قسە کەی بۆ کردوویت لە ئەهلی سوننە بێ:

ابانة الصغرى رەقم ١٠٨

---

٣٧٢. أبي حلال -رحمه الله- دەڵێت : سەردەمێک بەسەر خەڵکیدا دێت پیاو هەڵدەستێت پرسیار دەکات لە سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هیچ کەسێک نادۆزیتەوە وەڵامی بداتەوە

كتاب السنة للمروزي صـ١٢٨

---

٣٧٣. أبو سليمان الداراني وتی :

باشترینی کردەوەکان ئەوەیە پێچەوانەی هەوا و ئارەزووی نەفس بێت

السير (١٠/١٨٣)

---

٣٧٤. ئیمامی مکحول دەفەرمووێت :

پیاوێکم بینی دەگریا لە نوێژدا تۆمەتبارم کرد بە ڕیابازی

یەك ســـاڵ بێبەش کرام لە گریان

العقوبات لإبن أبي الدنيا ٦٣

---

٣٧٥. تابعی بەڕێز عبداللهی کوڕی عمری کوڕی عاص دەفەرمووێ:

الله عزوجل بەردێکی لەبەهەشت دابەزاندووە کە بەڕاستی زۆر سپیە و لەبەفر سپیترە و هیچ شتێک ڕەشی نەکردووە تاوانەکانی بەنی ئادەم نەبێت

مصنف إبن أبی شیبة ١٥٣٥٠

---

٣٧٦. خلادی کوڕی عبدالرحمن دەفەرمووێ لە سەعیدی کوڕی جوبەیرم پرسی:

کامە حەجکەر(حاجی) باشترە؟

فەرمووی: ئەوەی خواردن دەبەخشێت و زمانی خۆی دەگرێت

وە سوفیانی ثەوری فەرموویەتی:گوێمان لێبووە کە ئەمە بریتیە لە چاکەکانی حەج

مصنف عبدالرزاق٨٨١٦

---

٣٧٧. مَالِكَ بْنَ دِينَارٍ دەڵێ :

دڵ ئەگەر بێتوو خەمبار نەبێت خراپ دەبێت وەک چۆن خانوو تێیدا نیشتەجێ نەبیت کاوڵ دەبێ

الهم والحزن لابن أبي الدنيا(٨)

---

٣٧٨. حذيفة دەڵێ :

خۆتان بە صبرەوە هۆگر بکەن چوونکە بەڕاستی نزیکە بەڵا و فیتنەیەک تووشتان بێ قورستر لەوەی ئێمە تووشی بووین لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم کە ئەویش لە ژیاندا مابوو

السنن الواردة في الفتن للدائي (١٧)

---

٣٧٩. بشر بن الحارث - رحمه الله دەڵێت -: هەرکەسێک داوای دونیا لە الله بکات، ئەوە داوای زۆر وەستانی کردوە لە ساحەی مەحشەر بۆ لێ پرسینەوە.

الزهد لابن أبي الدنيا - (ص٣٨٥)

---

٣٨٠. أبو هريرة - رضِيَ الله عنه دەفەرموێت -:

لە کۆتایی زەماندا کۆمەڵێک زانا و سەرکردەی جاهیل هەن

فەتوا بۆ خەڵکی دەدەن بە بۆچونی خۆیان

خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن.

ذم الكلام للهروي (٣/٢٣٤)

---

٣٨١. یەکێ لە سەلەف دەفەرمووێت:

الله سبحان و تعالى قوەت و هێزی مرۆڤی ئیمانداری خستووەتە نێو دڵیەوە نەوەک ئەندامەکانی لاشەی، مەگەر نەتان بینیوە کە پیرێک لەوپەڕی لاوازی دایە کەچی بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت شەویش شەونوێژ دەکات، وە گەنجیش هەیە دەستەوەستانە و توانای ئەنجامدانی ئەمانەی نییە..!!

حلية الأولياء ٣/١٣٠

---

٣٨٢. شاذی کوری یحيي دەڵێت :- هیچ ڕێگایەک نییە بتبات بۆ بەهەشت لە ڕێگای لەسەر ئەثەربوون زیاتر .!

شرح اصول اعتقاد للاكائي

---

٣٨٣. گەنم لەسەر لوتکەی چیاکان بڵاو بکەنەوە با نەڵێن باڵندەکان لەژێر حوکمی ئیسلامدا برسی بوون .....!

"عومەری کوڕی عبدالعزیز"

---

٣٨٤. امامی دارمی(رحمه الله)دەفەرموێت : ئومەت یەك دەنگ بوون لەوەی الله تعالی لەسەر عەرشی خۆیەتی وە لەسەروی ئاسمانەوەیە.

[النقض : ١٥۴]

---

٣٨٥. قال التابعي ثابت بن أسلم البناني :

«كنا نتبع الجنازة فما نرى إلا مقنعاً باكيا أو متفكراً.»

تابعی ثابت بن أسلم البنانی فەرموویەتی:

«ئێمە کاتێک شوێنی جەنازە ئەکەوتین،نەمان ئەبینی ئیلا دەمامکداربوو و ئەگریا،یاخود خەریکی بیرکردنەوەی مردن بوو.»

[ الجعديات-١٣٩٧ ]

---

٣٨٦. حيان بن الأسود دەڵێ :

مردن پردێکە خۆشەویستان پێیدا دەگەنە خۆشەویستیان

المحبة لله للحافظ ابن جنيد (١٧٨)

---

٣٨٧. ابن الجوزية -رحمه الله- دەفەرمووێت:

هۆشیار بن هۆشیار بن لە تاوان، بەتایبەت تاوانی نهێنی، چونکە تاوانی نهێنی قەدر و قیمەتی مرۆڤ لای خوای گەورە ناهێڵێ و کەمی دەکات.

'صيد الخاطر' ص٢٠٧

---

٣٨٨. سعيد بن المسيب دەڵێ:

هیچ نزایەک نییە پێشەکی صەڵاواتی نەخوێندبێت ئیللا لە نێوان ئاسمان و زەوی هەڵواسراو دەبێت تاوەکو صەڵاوات لێدەدەیت بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

فضل الصلاة على النبي لابن إسحاق القاضي (٧٤).

٣٨٩. سعيد کوڕی یزید دەڵێ: بە انس کوڕی مالك م خوای لێ ڕازی بێت وت: ئایا پێغەمبەری خوا صل الله علیه وسلم بەنەعلەکانیەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ

صحيح_لسملم٢٣٢

٣٩٠. یحیی بن معَاذ دەیفەرموو : برسێتی خواردنێکە الله جەستەی ڕاستگۆکانی پێ بەهێزەکات.

[ عيوب النفس، صفحة ٩]

٣٩١. لیث دەگێرێتەوە کەوا : بە طاوسی گووت :

گەیشتووی بە هاوەڵانی رسول الله وە کۆتاییان بە ابن عباس هێنابێت ؟ واتا لە قسەکانیان ؟

طاوس گووتی :-

گەیشتووم بە ٧٠ لە هاوەڵانی رسول الله صلی الله علیه وسلم [ ئەگەر خیلافیان هەبوایە لە شتێک ئەوا کۆتاییان پێ ئەهێنا بە قەولی ابن عباس !..

الشريعة لإمام الآجري ١٩٥٢

٣٩٢. سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەفرموێت :

ابْنِ عَبَّاسٍ فەرمووی : هیچ کەسێک ڕۆناچێت لە قەدەردا ئیلا لە ئیمان دەرەچێت.

[القدر للفريابي ، صفحة ١٥٢]

٣٩٣. مَسْرُوق دەی ووت:

«هەرکەس پێی خۆشە زانستی ئومەتانی پێش و کۆتا و زانستی دونیا و ئاخیرەت بزانێت با سورەتی الْوَاقِعَةِ بخوێنێت».

[ مصنف ابن أبي شيبة، ٧/١٤٨]

---

٣٩٤. وترا بە ئیمامی الأوزاعی :

پیاوێك هەیە دەڵێت من لەگەڵ ئەهلی سونە دادەنیشم و وە لەگەڵ ئەهلی بیدەعیش دادەنیشم، ئیمامی الأوزاعی فەرمووی : ئەمە پیاوێکە دەیەوێت حەق و باطڵ یەکسان بکات.!

ابن بطەش لەسەر ئەم قسەی الأوزاعی دەڵێت :

ڕاستی کرد الأوزاعی، ئەمە پیاوێکە حەقی نەناسیوە لە باطڵ، نە کوفریشی ناسیوەو نەئیمانیش.

الإبانة_الكبرى_١_٢١٢

---

٣٩٥. قالــ إبن عيينــة ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ :

يـَأتي عَلـى النـَّاس زمـانٌ يجلِـس فـي مَساجِدهمـ شَيـاطِـين يُـعلّمـونَهُمـ أمْــر دينَهمـ .

" ڕۆژگـاریٚ دیٚ بـەسـەر خـەڵـکیٚ کـە لـە مزگـەوتەکان دادەنیشـن و شـەیتـانەکـان فێـری دینیـان دەکـەن "

' البدع لإبن وضاح صـ| ٢٦٥

---

٣٩٦. الربيع بن خثيم دەڵێت:

«هیچ نادیارێک نیە ئیماندار چاوەڕێی کات باشتربێت بۆی لەمردن».

[الزهد لوكيع (١/٣١٣)]

٣٩٧. ابن عون دەڵێ

ئەگەر ئەهواء بەسەر دڵێکدا زاڵ بوو ئەوەی پێشتر بە خراپی دەزانی ئێستا بە باشی دەزانێت.

الإبانة_الصغرى_٨٨

٣٩٨. عومەری کوڕی عبدالعزیز دەیفەرموو:

هەر کەسێک دینەکەی بەکار بێنێت بۆ مناقەشە، ئەوا زۆر دین و بیر و باوەڕی دەگۆڕێت، زوو لادەدا لە ڕێگا .!

الزهد ريوايه عبدالله ص (٣٦٦)

٣٩٩. بلال بن سعد (رحمه الله) ئەفەرموێت : چەند کەسی وا هەیە دڵخۆشە بەڵام لەوانەیە خەسارەتمەند بێت و هەستی پێ نەکات بخوات و بخواتەوە پێ بکەنێت، بۆی دانرابێت لە کتێبی الله جل جلاله کە سوتەمەنی ئاگرە!

«عبدالله بن احمد فی زوائد ٢٣٢٠»

٤٠٠. تەقلید بۆ کێ ؟!

باوکی یعقوب "إِسحاقُ بنُ رَاهويه" رَحمةُ اللّٰه تعالىٰ عليهِ ئەفەرمووێ : ( ئێمە شوێنکەوتەین و ئیقتیدا بە ڕێبازی ئەئیمەی ئەم ئوممەتەو سەلەف و زانایانی پێشوومان ئەکەین ڕەحمەتیان لێبێت ,, هیچ شتێک داناهێنین و باسی ناکەین کە لە کتێبی الله (قورئان) دا نەبێت و باس نەکرابێت یان لە سوننەت نەبێ یان ئیمامێکمان باسی نەکردبێت ). ١

ئیمام بەربەهاری رَحمةُ اللّٰہ تعالیٰ علیهِ دەیفەرموو: ( ئاگاداربە و بزانە کە دین تەقلید و ئیقتیدا پێ کردنە ,, تەقلید بۆ هاوەڵانی محمد ﷺ ). ٢

پێشەوا أحمد بن حنبل رَحمةُ اللّٰہ تعالیٰ علیهِ بە المیموني دەفەرموو: ( ئەی باوکی حەسەن ئاگاداربە لە قسە کردن لە مەسئەلەیەکدا کە ئیمام و پێشەوات تێیدا نەبێت و لەسەری نەدوابن ). ٣

حَرب ـی کوڕی اسماعیل ـیش رَحمةُ اللّٰہ تعالیٰ علیهِ فەرمووی: (... پاشان , ئەیانەوێ بە قسەکانیان ئەثەری سەلەف بەدرۆ بخەنەوەو پەکی علم بخەن و سوننەت بشارنەوە ,, وە ئەیانەوێ زیادەڕەوی بکەن بە ڕەئی و ووتەی خۆیان و بە بیدعەو درووست کردنی خیلاف ,, ئەوانەی بیروباوەڕیان وایە و ئەو شتانە ئەڵێن بەر لەعنەتی الله و فریشتەکان و خەڵک بکەون بە تێکڕا ). ٤

سُفیان الثَّوري رَحمةُ اللّٰہ تعالیٰ علیهِ دەیفەرموو: ( ئەگەر لەتوانات ـدا هەبوو سەرت نەخورێنیت ئیللا بە ئەثەری سەلەف نەبێت ,, ئەوە وا بکە ). ٥

1 السنة للخلال (٩٨١٢)

2 شرح السُّنَّة

3 سير أعلام النبلاء (١١/٢٩٦)

4 السُّنَّة للخلاَّل

5 الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع (١٧٩)

---

٤٠١. منصور بن زاذان ( ڕەحمەتی الله ی لێبێت )دەفەرموێت : هەواڵم پێدراوە کە هەنێ کەس دەخرێنە نێو دۆزەخەوە تەنانەت دۆزەخیەکانیش بێزار ئەبن و ئازاریان پێدەگات لەو بۆنەی لێوەی دێت ،

پێی ئەوترێت وەیل بۆتۆ ، ئەوە تۆ چی كارێكت كردووە وا ئاوهایت ، لەو ناخۆشیەیَ خۆمان تێیداین بەس نەبوو هەتاوەكو تۆیشی هاتە سەر و تووشی تۆیش بووین لەبەر ئەو بۆگەنیەت ، دەڵێت: من كەسێكی زانا بووم بەڵام سوودم لە زانستەكەم وەرنەگرت.

«الزهد امام احمد ٢٢٥٥»

---

٤٠٢. عومەری كوڕی خەتاب ( ڕەزای الله تعالى لێبێت) دەفەرموویت :

بەوە خۆتان مەخەڵەتێنن كە قورئان زۆر دەخوێننەوە چونكە ئەمە تەنها قسەیەكە و دەیكەن ، بەڵكو تەماشای ئەوە بكەن كە كێ كاری پێ دەكات.

صحيح أنظرحديث رقم ١٩٨٦ في الجامع

---

٤٠٣. هەڵوێستی ( ئیمام شافعی )و ( ئیمام احمد ) بەرامبەر بە سۆفی گەرێتی

ئیمام شافعی: ( ئەگەر پیاوێک لەسەرەتای ڕۆژدا بوو بە سۆفی ، نیوەڕۆی بەسەردا نایەت ئیلا دەبێت بە كابرایەكی گێل ، وە ناشبێت كەسێک ٤٠ ڕۆژ لەگەڵ تەسەوف و سۆفیگەرێتیدا بێت ، پاشان عەقڵی بۆ بگەڕێتەوە.

«تلبيس إبليس لابن الجوزى : ٣٧١ »

ئیمام احمد : ( ئەگەر یەكێكت لەو كۆمەڵەیە بینی بەڕێگەیەكدا دەچوو ، ئەوا تۆ ڕێگایەكی تر بگرە بەر .

( المسائل والرسال : ٢ / ٢٧٦ )

---

٤٠٤. قَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ 'رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ':

« اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ بَعْدَ أَنْ تَعْلَمُوا، فَلَنْ يَأْجُرَكُمُ اللَّهُ تَعَالَى بِالْعِلْمِ حَتَّى تَعْمَلُوا ». " چ كردەوەيەكى «چاكتان» دەوێت ئەنجامى بدەن، پاش ئەوەى فێرى دەبن، چونكە الله تعالىٰ پاداشتتان ناداتەوە بەهۆى زانست تاوەكو كارى پێ دەكەن ". 'سنن الدارمي | ٢٦٦'

---

٤٠٥. تابعى بەڕێز ئیمام مجاهد - رحمه الله - دەڵێت:-

لا أدري أي النعمتين أفضل، أن هداني للإسلام أو عافاني من الأهواء.

نازانم كام لەم دوو بەخششە چاكتر و گەورەترە، لەوەى كە خوداى گەورە ڕێنمويى كردوم بۆ ئیسلام، یاخود پاراستومى لە هەواو ئارەزوو.

[ حلية الأولياء ٣/ ٢٩٣ ].

---

٤٠٦. قال الفضيل بن عياض رحمه الله :(لا تجلس مع صاحب بدعةٍ،فإني أخاف أن تنزل عليك اللعنة)

واتا :فضیلى كورى عیاض رەحمەتى الله ــى لێبى فەرموویەتى:«لەگەڵ كەسانى بیدعە چى دامەنیشە ، چونكە من ئەترسم نەفرەت دابەزێتە سەرت بەهۆى دانشتنتەوە لەگەڵى»

شرح أصول اعتقاد السنة والجماعة (٢١٥/١)

---

٤٠٧. قَالَ يَحيىٰ بِن مُعَاذ رَحِمَهُ الله :

" لستُ آمركُم بتركِ الدُّنيا آمركم بتَركِ الذُّنوب تَرك الدُّنيا فضِيلة وتَرك الذُّنوبِ فريضَة وأنتُم إلىٰ إقامة الفَريضة أحُوجَ مِنكُم إلىٰ الحسناتِ والفضَائل"

یەحیاى كوڕى موعاذ ڕەحمەتى الله لێ بێت فەرموویەتى:

«من فەرمانتان پێ ناکەم واز لە دونیا بهێنن، فەرمانتان پێدەکەم واز لە گوناهەکان بهێنن، وازهێنان لە دونیا فەزیلەتە، وە وازهێنان لە گوناهەکان فەرزە، وە ئێوە پێوستان بە کردنی فەرزەکانە زیاتر لە کردنی چاکە وفضیلەکان.»

[صفة الصفوة ]

٤٠٨. مەکحول ' رحمه الله ' دەڵێ:

« ئەگەر فەزڵ لە جەماعەت بێ، ئەوا لەم ڕۆژەدا سەلامەتی دین لە گۆشەگیری دایە »

| العزلة لابن أبي الدنيا : ٢٧ |

٤٠٩. أبي هريرة دەڵێ :

ئەگەر بێتوو بەندە تاوانێکی ئەنجامدا وە الله تعالى ئەم بەندەی بینی کە دڵ تەنگ بوو لەسەر ئەنجامدانی تاوانەکەی ئەوە لێی خۆش دەبێت بەبێ زیادکردنی نوێژ و خێر

الهم والحزن لابن أبي الدنيا (١١١)

٤١٠. عبد الله ـی کوڕی مسعود ' رضي الله عنه ' دەفەرمووێت :

«ئەو ماڵەی قوڕئانی تێدا ناخوێنرێت هاوشێوەی ماڵێکی وێرانە کە هیچ ئاوەدانیەکی تێدا نییە»

| مصنف ابن أبي شيبة : ٣٠٠٢٢ |

٤١١. پرسیارکرا لە ابن عمر رضی الله عنه :

ئایا هاوەڵاکان رضی الله عنهم پێدەکەنین؟ فەرمووی : بەڵێ، وە ئیمان لە دڵیشیاندا وەك شاخ وابوو.

جامع_العلوم_والحكم_ص٦٦

٤١٢. قاسمی کوڕی موحەمەد وەصیەتی کوڕەکەی کرد،فەرمووی:-

ئاموژگاریت ئەکەم بە کتابی الله،وە بەشەکەی خۆتی تێیدا لەبیر مەکە،وە هەموو ڕۆژێک جوزئێکی لی بخوێنەوە،وە ئەمە بکە ئەرکێک لەسەرت.

| طبقات الفقهاء الشافعية، لابن الصلاح (٦٦٧/٢)

---

٤١٣. وهب بن منبه - رحمه الله - دەڵێت:-

إِذَا سَمِعْتَ مَنْ يَمْدَحُكُ بِمَا لَيْسَ فِيْكَ، فَلاَ تَأْمَنْهُ أَنْ يَذُمَّكَ بِمَا لَيْسَ فِيْكَ.

ئەگەر گوێت لە کەسێک بوو مەدح و ستایشت دەکات بە ئەو شتەی کە لە تۆدا نیە، ئەوە هیچ ئەمین مەبە لێی لەوەی کە زەمیشت بکات بە شتێک کە لە تۆدا نیە.

[ السير أعلام النبلاء ]

---

٤١٤. پرسیارکریا لە عبداللهی کوڕی مبارک : ئایا کەسانی ئەهلی عیلم هیچ نیشانەیەکیان هەیە تا بیان ناسینەوە؟

ئەویش وتی : نیشانەی ئەهلی عیلم ئەوەیە عەمەل بە عیلمەکەی بکات، و زۆر عیلم بەدەست بێنێت و لەخۆیدا جێ بەجێی بکات، و حەزبکات خەڵکانی تریش فێری ببن، و حەق لە هەرکوێ هات قەبولی بکات و عیلم وەربگرێت لە هەر جێیەک هەبوو، ئا ئەوە نیشانە و وەصفی ئەهلی عیلمە.

ابطال_الحيل_لابن_بطة

---

٤١٥. أبـو إسـحـاق الفـزاري دەفەرمـویـت :

خـەڵـکـی وا هـەیـە حـەزدەکات وەسف بـکـریـت و پـێـاهـەڵـبـدرێـت لای الله جل جلاله قـەدری بـاڵـە مـێـشـولـە کـی نـیـە.

حلية الأولياء

---

٤١٦. زۆرترین قسەی بریتی بوو لە «اللهم أمتنا على الإسلام والسنة»

طلحة البغدادي دەڵێت : لەگەشتیەك لەگەڵ ئیمامی ئەحمەد سوار بووم، بەدرێژایی ڕێگا بێدەنگ بوو، ئیمام کاتێك قسەی دەکرد دەی فەرموو : «اللهم أمتنا على الإسلام والسنة»

یا الله لەسەر ئیسلام و سوننەت بمان مرێنە .

[طبقات الحنابلة]

---

٤١٧. إبن عەون لەکاتی مردن دا ئـەیـوت:

دەست بە سوننەتەوە بگرن دەست بە سوننەتەوە بگرن ، دوور بکەونەوە لە بیدعە ، هەتـا مرد..

السنة للبربهاري | ٦٧٨

---

٤١٨. شێخ محمد بن عبدالوهاب(١٢٠٦هـ) دەڵێ:

ئەگەر مرۆڤ بەیەک وشە قسەیەکی کرد یان وەسفی #طاغوتانی کرد یان مناقەشەی دەکرد لەسەریان ئەوا بەوە لەئیسلام #دەردەچێ ئەگەرچی بەڕۆژوو بێت و شەونوێژیش بکات .

الدُّرَر السَّنِيَّة | ١٠/٥٥ |.

---

٤١٩. تابعی بەڕێز إبراهیمی نخعی دەفەرمووێ:

بەڕاستی ئێمە حەزمان دەکرد کاتێك داخڵی ناو مەککە دەبوین نەهاتباینە دەر تاوەکو قورئانمان خەتم نەکردبایە

مصنف إبن أبی شيبة٨٨٦٢

---

٤٢٠. پرسیارکرا له تابعی مسروقی کوڕی اجدع دەربارەی ئایەتی { والفجر وليال عشر }

فەرمووی ئەم دە ڕۆژه باشترین ڕۆژەکانی ساڵه

( عبدالرزاق في المصنف ٨١٢٠ )

---

٤٢١. عەطاء پرسیاری لێ کرا دەربارەی شتێك ، ئەویش وتی لا ادری (نازانم)ٚ ئینجا پێی وترا بۆ قسەی لەسەر ناکەی به بۆچونی خۆت ؟ وتی من شەرم دەکەم له الله تعالی کەوا دینداری له زەویدا ئەنجام بدرێت لەسەر بۆچونی من.

سنن_الدارمی١٠٨

---

٤٢٢. قال أبو بكر بن عياش : رأيت أبا إسحاق السّبيعي يبكي ..

فقلت : يا أبا إسحاق ما يُبكيك ؟ !

قال : ذهبَت قُوَّتِي ، وذهبَت الصلاة

مني ؛ ما أستطيع أن أصلي قائمًا إلا بالبقرة وآل عمران :

واته: ئەبو بکری کوری عیاش دەڵێت : باوکی ئیسحاقی السبیعیم بینی دەگریا ..

منیش پێم وت بۆ دەگریت ؟

ئەویش وتی : هێز و قووەتم رۆیشت وه نوێژیش بەجێی هێڵام،ناتوانم به پێوه نوێژبکەم تەنها سورەتی البقرة و آل عمران ئەتوانم بخوێنم!!

الثقات لابن حبان/حديث : ٤٩٩

---

٤٢٣. بۆچی لە قورئان دا ووشەی : ( الظُّلُمَات ) بە کۆ " جمع " هاتووە ، بەڵام ووشەی : ( النُّورُ ) بە تاک " مفرد " هاتووە ؟!

ئیمامی إبن القیم ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

ئەمە لە إعجازی قورئان و زمانی عەرەبیە ، لەبەرئەوەی ڕێگای حەق تەنها یەک ڕێگایە ، بەڵام ڕێگای باطل ئێجگار زۆرە

---

٤٢٤. قال يحيى بن معاذ (٢٥٨): «بئس الأخ أخ تحتاج أن تقول له: اذكرني في دعائك» پێشەوا یحیى ـی کوڕی معاذ (٢٥٨ ه) دەفەرمووێت:

«خراپترین هاوڕێ ئەو هاوڕێیەیە پێویست بکات پێی بڵێی لەبیرم مەکە لە دوعاکانت»

الآداب الشرعية لابن مفلح (٥٨٢)

---

٤٢٥. جاری وا ئەبێ بەهۆی وشەیەکەوە کە لە کەسێکییەوە دەبیستیت خودا چەندین ساڵ سودت پێدەگەیەنێت .

زوبەیدي کوفی وتویەتی : وشەیەکم بیست ، خودا بەهۆیەوە سی ساڵ سودی پێگەیاندم .

قال زبيد الكوفي رحمه الله : " سمعت كلمة فنفعني الله بها ثلاثين سنة " .

[ سير اعلام النبلاء ٢٩/٥ ]

---

٤٢٦. کعب_بن_مالك دەفەرموویت: هەر کەسێ یادی خوا زۆر بکات ؛ توشی نیفاق نابێت

شعب الإيمان ٢/٩٥

---

٤٢٧. قال أبو عبدالله العكبري :

وای بۆ ئەوکەسەی قوڕئان و سوننەت رێنومای نەبێت ، چەندە رێگەکەی بزرکردووە و بارودۆخی تێکچووە و ، حاڵی خراپ بووە.

[«الإبانة الكُبرى» (٣/٩٨)]

٤٢٨. ابن مسعود دەڵێ:

سوێند بە الله ئەوەی فەتوا بۆ خەڵک بدات لە هەموو ئەو شتەی پرسیاری لێ دەکەن ئەوە شێتە.

كتاب العلم لأبي خيثمة (١٠).

٤٢٩. شەقیقی بەڵخی دەفەرموێت: وترا بە ئیبن موبارەک: کاتێک نوێژ دەکەیت بۆ لەگەڵمان دانانیشیت؟

ئەویش فەرمووی: لەگەڵ هاوەڵان وتابعین دادەنیشم سەیری نوسراو وئاثارەکانیان دەکەم، چی بکەم لەگەڵ ئێوە؟ ئێوە خەریکی غیبەتکردنی خەڵکن.

بڕوانە سير أعلام النبلاء بەرگی٨ لاپەڕە٣٩٨

٤٣٠. «««هەمیشە ئەم دوعایە بکە »»»

كان عبدالله بن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ـ يدعو فيقول :ـ

اللهم لاتنزيع مني الإمان كما أعطيتنيه .

عبداللهی کوڕی عمررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نزای دەکرد و دەی فەرموو:-

یارب ئیمانم لێ نەستێنیتەوە وەک چۆن پێت بەخشیوم.

{ابن ابی شیبة في المصنف٩٦٤ ٣٠ }

٤٣١. فوضەیلی کوڕی عیاض دەڵێ:

ووتنی أستغفرالله بەبێ دەست هەڵگرتن لەتاوان، تەوبەی درۆزنەکانە..

كتاب_الأذكار (٤٨١)

٤٣٢. حسن البصري فەرموویەتی:

«ڕۆژوو گرتنی ڕۆژێک لە دەڕۆژی ذي الحجة مقابیلی خێری ڕۆژوو گرتنی دوو مانگە»

فضل عشر ذي الحجة للطبراني(٢٥)

---

٤٣٣. ئیمامی الشَّعبِي رَحِمَهُ اللّٰهُ دەفەرمووێ:- قیامەت بەرپا نابێت تاوەکو هەبوونی زانست و زانیاری نەبێتە نەزانی ، وە نەزانیش نەبێتە زانست و زانیاری!!!

المُصَنَّف لإِبنُ أَبِيشَيبَة(١٧٦/١٥)

---

٤٣٤. اسماعیل بن رجاء دەڵێ: منداڵەکانمان کۆ دەکردەوە و فەرموودەمان بۆ دەگێڕانەوە.

كتاب العلم لأبي خيثمة (٧٣)

---

٤٣٥. عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) فەرموویەتی:ئەگەر کەسێک لە ئێوە بزانێت لە حەقیقەتی جەهەننەم وەک خۆی،ئەوا دەست دەکات بە هاوار و قیژە لە ترسی جەهەننەم تاوەکو دەنگی دەپچڕێت، وە نوێژ دەکات تاوەکو پشتی دەشکێت.

زوائد الزهد لابن المبارك (١٠٠٧)

---

٤٣٦. کەسێک بە پێشەوا سفیانی الثوري فەرموو: دوعام بۆ بکە، سفیان فەرمووی: وازهێنان لە تاوان دوعایە.

تفسير الطبري (٢٠/ ٣٥٤)

---

٤٣٧. تابعي عُبيد بن عمير الليثي - رحمه الله - دەڵێت :

کاتێك دەجال دەردەکەوێت خەڵکی شوێنی دەکەون و دەڵێن : ئێمە دەزانین و شاهێدی دەدەین کە ئەو کافرە بەڵام ئێمە تەنها شوێنی ئەکەوین بۆ خواردن و بەروبومی دارەکان جا کاتێك تورەیی الله دادەبەزێ ئەوا دادەبەزێتە سەر هەموان.

[الفتن لنُعيم بن حّماد (٧/٣٧٤)]

٤٣٨. تابعي عُبيد بن عمير الليثي - رحمه الله - دەڵێت :

کاتێك دەجال دەردەکەوێت خەڵکی شوێنی دەکەون و دەڵێن : ئێمە دەزانین و شاهێدی دەدەین کە ئەو کافرە بەڵام ئێمە تەنها شوێنی ئەکەوین بۆ خواردن و بەروبومی دارەکان جا کاتێك تورەیی الله دادەبەزێ ئەوا دادەبەزێتە سەر هەموان.

[الفتن لنُعيم بن حّماد (٧/٣٧٤)].

٤٣٩. شێخی ئیسلام ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێت:

"هەرکەسێک غیرە نەکات و غیرەتی نەجوڵێت کاتێک سنورەکانی الله تعالی دەبەزێندرێت، وە لەپێناو الله تعالی توورە نەبێت، وە فەرمان بە چاکە و نەهی لە فەسادی و خراپە نەکات، وە جیهاد و تێکۆشان نەکات لە پێناو الله تعالی ئەوە فاسقێکی دەرچوە، بەڵکو کافرە، ئەگەر بە ڕواڵەت ئیسلامەتیش دەربخات ئەوە موونافیقە، ئەگەر چی بەشی زۆریشی لە زوهد و عیبادەتەکانی تری هەبێت.

'الاستقامة' بەرگ و پەڕاوی ٢/٣٤'

٤٤٠. ئیمامی إِبْنُ الْقَيِّم الْجُوزِيِّة رَحِمَهُ اللّٰهُ دەفەرمووێ:-

لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ کاریگەریەکی سەر سووڕهێنەری هەیە ، لە لابردن و نەهێشتنی هەژاری!!!

الْوَابِلُ الصَّيِب صَفحَة ١٠٦

٤٤١. ئیسماعیلی کوڕی عوبێد دەفەرموێت: "کاتێک باوکم لە سەرەمەرگیدا بوو هەموو منداڵەکانی کۆکردەوە وپێی فەرموون: ئەی ڕۆڵەکانم ئاگاتان لە سەلامەتی وپاکی دڵتان بێت، سوێند بەخوا لەو دەرگایە نەچومەتە دەر وگەیشتبێتم بەهەر موسوڵمانێک ئیلا خێر وخۆشیم وویستووە بۆی"

حلية الأولياء ٦/٨٩

٤٤٢. ئیمامی أَبُو حَاتِم رَحِمَهُ اللّٰهُ دەفەرمووێ:-

جاسووسی کردن بەسەر خەڵکیدا یەکێکە لە بەشەکانی نیفاق و دوو ڕوویی ، هەر وەکو چۆن گوومانی چاك یەکێکە لە بەشەکانی ئیمان و باوەڕ!!!

رَوضَةُ الْعُقَلاَء (١٢٦/١)

٤٤٣. ئەبو شهابی زوهری سەبارەت بە زانستی السيرة دەفەرمووێ( علم السيرة علم الدونيا والآخرة)

واتە: زانستی ژیان نامەی پێغەمبەر ﷺ تەواوی ناسینی زانیاریەکانی هەموو دونیا و قیامەتە

٤٤٤. هەندێك لە تابیعەکان رَحِمَهُمُ اللّٰهُ دەفەرموون:-

هەر کەسێك گوناهـ و تاوان زۆر بوو ، ئەوا با بچێت ئاو دابەش بکات بەسەر خەڵکیدا!!!

تَفْسِيرُ الْقُرطُبِي (٢١٥/٧)